- داگیرکردنی سەربازی ڕاستەوخۆ، بەڵام لەژێر چەتر و پابەندییە نێودەوڵەتییەکان.
- هاوپەیمانی سەربازی.
- ڕێکەوتنی دیپلۆماسیی و سیاسی.
- ڕێکەوتنی ئابوریی و دارایی و وەبەرهێنان.
- بڵاوکردنەوەی کولتووری کۆمەڵایەتی و ئایینی و نەتەوەیی.
- ڕێکەوتنی ئەمنی و هەواڵگری.

**چوارەم: ئیمپریالیزمی چینی لە ئەفریقیا:**

چین وڵاتە هەژارەکان یان ئەو وڵاتانەی پێویستیان بەنەختینە هەیە دەکاتە ئامانج. قەرزی زەبەلاحیان پێدەدا بۆ پرۆژەکانی وەبەرهێنان و پەرەپێدان، دوای ئەوەی ئەو وڵاتانە ناتوانن قەرزەکان بدەنەوە؛ چین دەستدەگرێت بەسەر ئەو پرۆژانە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کەمی ڕێژەی سووی قەرزەکان کە کەمترە لە ٣٪، کەچی سووەکانی قەرزی ئەمریکا دەگاتە ٥٪.[٤]

هەر لەمیانەی دەستپێشخەری پرۆژەی پشتێنە و ڕێگا، چین (٨) ملیار دۆلاری قەرز داوەتە سریلانکا لە سەردەمی سەرۆکی پێشووی ماهیندرا ڕاچاباکسا بۆ دروستکردنی چەند پرۆژەیەکی پەرەپێدانی ژێرخانی وڵاتەکە، لەوانەش پرۆژەی بەندەری هامبانتونا. بەڵام سریلانکا نەیتوانی قەرزە کەڵەکەبووەکانی بە چین بداتەوە لەکاتی خۆی و بەناچاری لە ساڵی ٢٠١٧ پشکی ٧٠٪ پرۆژەکەی بەخشییە چین بۆ ماوەی ٩٩ ساڵ، ئەمەش هۆی سەرەکی بوو بۆ ئیفلاسبوونی دەوڵەت و سەرهەڵدانی ڕاپەرینی گەلی سریلانکی و هەڵهاتنی سەرۆکەکەی.

ئێستا چین وەکو ئەوروپا لە ڕابردوو، هەوڵی داگیرکردنی تەواوی ئەفریقیا دەدات، بەڵکو سەرۆکی پێشوتری زامبیا پێیوایە داگیرکاری چین خراپترە بەراورد بە ئەوروپا. میشال ساتا پێش ئەوەی ببێت بە سەرۆکی زامبیا، لە توێژینەوەیەکی کە پێشکەشی زانکۆی هارڤاردی ئەمریکی کردبوو بە ڕاشکاوانە گووتی: کۆلۆنیالیزمی ئەوروپی بەراورد بە ئیستغلالی چین باشتر بوو؛ چونکە هەرچەندە هەردوولا وەک یەک بوون لەڕووی ئیستغلالی بازرگانی بۆ ئەفریقیا، بەڵام ئەوروپییەکان وەبەرهێنانیان ئەنجامداوە لەژێرخانی ئابووریی و کۆمەڵایەتی. هەروەها گوتیشی: کۆلۆنیالیزمی چینی بەنیازە بە زۆرترین قازانجی داراییەوە دەرچێت لە ئەفریقیا، بێ ئەوەی ڕەچاوی ژیانێکی خۆش بۆ

---

٤ ڕاپۆرتی پێگەی عەرەبی پۆست.

دانیشتوانی ئەو وڵاتانە بکات».[٥]

ئێستا چین لە ئیمپریالیزمی دارایی ڕێدەکات بۆ کۆلۆنیالیزمی سەربازیش؛ لە نزیک هەر بیرە نەوتێک لە ئەفریقیا و ئاسیا، چین بنکەیەکی سەربازی دادەمەزرێنێ.[٦]

شێوازێکی تری ئیمپریالیزمی چین بۆ وڵاتان بریتییە لە وابەستەکردنی سەرکردەی ئەو وڵاتانە بە سیاسەت و ئەجێندای خۆی. ئەمەش لە ڕێگای کردنەوەی خولی ڕاهێنانی سەرکردە گەنجەکانی وڵاتە دواکەوتوو و هەژارەکان. هەر لەمیانەی ئەو ڕاهێنانەش لە بەیجینی پایتەختی چین، ئەو ڕاهێنراوانە سەرسام دەکرێن بەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژیی و پیشەسازی و بازرگانییانەی چین، ئەمە سەرەڕای چۆنیەتی ئیدارەدانی حزب و حکومەت و دەزگا هەواڵگریی و ئەمنییەکان. بۆ نمونە، تەنها لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٠ بۆ ٢٠١١، چین (٥٣٩) خولی ڕاهێنانی بۆ بەرپرسە باڵاکانی وڵاتانی جیهان کردووەتەوە. کە تەنها پشکی وڵاتانی ئەفریقی بریتی بووە لە (٨٦٠٠٠) سەرکردە. هەروەها تەنها لە ساڵی ٢٠١٣ لەچوارچێوەی پرۆگرامی (ڕاهێنانی سەرکردەی حزبە سیاسییەکان)، چین ڕاهێنانی بە (٢٠٠) سەرکردەی گەنجی ئەفریقی کردووە. هەروەها لە نێوان ساڵانی ٢٠١٥ بۆ ٢٠١٨، ڕاهێنانی بۆ (١٠٠٠) سەرکردەی گەنج ئەنجامداوە.[٧]

بێگومان چین ئەو پەیوەندییانە لەگەڵ سەرکردە ئەفریقییەکان بەکاردەهێنێ بۆ پاڵشتی دیپلۆماسی. کیشوەری ئەفریقیا لە (٥٤) دەوڵەت پێکهاتووە کە نزیکەی چارەکێکی وڵاتانی جیهان دەگرێتە خۆی. بۆیە چین گرنگییەکی دیپلۆماسی بە ئەفریقا دەدات بەتایبەت لە ساڵی ١٩٧٢ کاتێک (٢٦) وڵاتی ئەفریقی لە نەتەوەیەکگرتوەکان لە بەرژەوەندی چین بڕیاری پێدانەوەی کورسییەکەیان بۆدا و لەوکاتەوە گرنگی دیپلۆماسی ئەفریقیای زیاتر بۆ دەرکەوت.

پێنجەم: سیاسەتی «سامانە سروشتییەکان بەرامبەر بنیاتنانی ژێرخان»:

ئەفریقا سەرچاوەیەکی دەڵەمەندە بە کاڵا و کانزا بە نرخەکانی جیهانی وەک: نەوت، مس، زێڕ، ئەڵماس، فسفۆڕ، پلاتین، کولتان، هتد...

سیاسەتی چین، بریتییە لە پێدانی قەرز بۆ دروستکردنی ژێرخان لە بەرامبەر ئەوە وەرگرتنی سامانە سروشتییەکانی ئەفریقیا هەتا تەواوبوونی قەرزەکان.

ئەفریقاش بووەتە سەبەتەی خۆراک بەتایبەت دانەوێڵە بۆ چین؛ چونکە ساڵانە چەندین ملیۆن دانیشتوانی چین زیاد دەکات و ئەوانەش پێویستیان بە خۆراکە، بۆیە چین بۆتە دووەم هاوردەی ئەفریقیا بۆ خۆراک کە ئەمەش بۆ ئاسایشی خۆراکی گرنگە.

---

٥ گۆڤاری فۆریسی ئەمریکی.

٦ ئاژانسی ماکێنزی ئەمریکی.

٧ پێگەی الجزیره.

داتاکان ئاماژە بە گرنگی کیشوەری ئەفریقیا بۆ چین دەکەن، لە ساڵی ٢٠٢١ ئاڵوگۆڕی بازرگانی لە نێوان چین و ئەفریقیا گەیشتووەتە نزیکەی (٢٥٥) ملیار دۆلار، کە بەڕێژەی (٣٥,٣٪) ساڵانە زیادی کردووە.[٨]

چین تەنها لە ماوەی نێوان ساڵەکانی ٢٠٠٥ تا ٢٠١٩ نزیکەی (٥٤٤) گرێبەستی بینای ژێرخانی لەگەڵ ئەفریقیا واژۆکردووە بە بڕی (٢٦٧,٧) ملیار دۆلار، کە ئەمەش سێیەکی کۆی گشتی نرخی پرۆژەکانی بنیادنانی چینە لە گشت جیهان.[٩] هەروەها چین پێیوایە تا ساڵی ٢٠٢٥ دەتوانێت قازانجەکانی بگەیەنێتە نزیکەی (٤٤٠) ملیار دۆلار لەگەڵ ئەفریقیا.[١٠]

> **سیاسەتی چین، بریتییە لە پێدانی قەرز بۆ دروستکردنی ژێرخان لە بەرامبەر ئەوە وەرگرتنی سامانە سروشتییەکانی ئەفریقیا هەتا تەواوبوونی قەرزەکان.**

جیاوازی نێوان پرۆژە بازرگانیی و مامەڵەداراییەکانی ئەمریکا و ئەوروپا لەلایەک و چین لەلایەکی تر:

١- گرێبەست و مامەڵە بازرگانی و پرۆژە ئابوورییەکانی چین لەگەڵ وڵاتانی تر هیچ چاودێریی و لێپرسینەوەیەکی لەسەر نیە لەلایەن پەرلەمان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و میدیا چینیەکان؛ چونکە لە چین تاک حزب بەڵکو تاک سەرکردە و سەرۆک حوکم دەکات. بەڵکو هەندێک جار گرێبەستەکان بەنهێنی دەمێننەوە لە نێوان هەر دوو وڵات. لە لێکۆڵینەوەیەکی (ئید داتا) -دەستەیەکی پەرەپێدانی نێودەوڵەتییە- کەپێی هەستاوە، دەرکەوتووە نیوەی قەرزەکانی چین بۆ وڵاتان ئاشکرا ناکرێن و لە دەرەوەی بودجەی حکومەتەکانە. هەر هەمان لێکۆڵینەوە ئاشکرای کردووە کە (٤٠) وڵات ئەو قەرزە نهێنییانەیان وەرگرتووە.

---

٨ دەستەی نیشتمانی گشتی چینی بۆ گومرگەکان.

٩ ناوەندی لێکۆڵینەوەی جەزیرە، مستەفا ئەلجالی، ٢٠٢١.

١٠ فرانس ٢٤، ئەیلولی ٢٠١٨.

هەرچی گرێبەست و پڕۆژەکانی ئەمریکا و ئەورووپایە لە دەرەوەی وڵاتەکانیان، تاڕادەیەکی زۆر بە فلتەری لێپرسینەوەی پەرلەمان و چاوێری میدیا و فشارەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی تێدەپەڕێت.

٢- چین بەرەهایی مامەڵە و پشتیوانی دەسەڵاتدارانی وڵاتە دیکتاتۆر و گەندەڵەکان دەکات بێ ڕەچاوکردنی مافەکانی مرۆڤ و مافی گەلە ستەملێکراوەکان. بەڵام ئەو جۆرە ڕەهاییە لە ئەمریکا و ئەورووپا نیە؛ چونکە مامەڵە و پشتیوانییەکان بەرژەوەندییە باڵاکانی وڵاتەکە و ڕەچاوکردنی مافەکانی مرۆڤ تاڕادەیەک سنورداری دەکات و هەندێک جار مامەڵەکان دەبەستنەوە بە حوکمی ڕەشید و شەفافیەت. هەربۆیە سودمەندی سەرەکی لەو گرێبەستانەی چین، حکومەتە گەندەڵەکانن نەک گەلە هەژارەکان.

٣- زۆر لە پرۆژەکانی چین، دەستی کار لەگەڵ خۆیان دەبەن بۆ ئەو وڵاتانەی لە بنەڕەتدا گەلەکەی بەدەست بێکارییەوە دەناڵێنن. بەڵام کۆمپانیا ئەمریکی و ئەورووپییەکان تەنها کارمەندە هونەرییە شارەزاکان لەگەڵ خۆیان دەبەن.[١١]

٤- کۆلۆنیالیزمی کۆنی ئەورووپا و ئەمریکا بەپێی یاسای نێودەوڵەتی و پێوەرە ئەخلاقییەکانی داگیرکاری، جۆرێک لە پابەندبوونیان هەبووە بەرامبەر گەلە داگیرکراوەکان لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکان و بنیاتنانەوەی دامەزراوەکانی دەوڵەتە داگیرکراوەکان و برەودان بە پەرەپێدانی پەروەردە و فێرکردن و کۆمەڵگەی مەدەنی، بەڵام داگیرکاری چینی هیچ پابەندبوونێکی یاسایی و ئەخلاقی بەرامبەر ئەو وڵاتانە و گەلەکانی نییە و خۆی بواردووە لە پێشکەشکردنی هەر خزمەتگوزارییەک جگە لەو ڕێکەوتنە فەرمییەی لەناو گرێبەستەکان هەیە.

---

١١ الاستعمار الصامت.. كيف تغزو الصين قلب أفريقيا؟ هند عبد الحميد، پێگەی الجزيرە.

## (١) ئاڕاستەی دین و ئیختیاری ئینسان..!

ئەوانەی بەدوای زانیاری باس و خواستی ڕووداوە کاریگەرەکانی دنیادا ئەگەڕێن دێتەوەبیریان کە سەرەتای سەرهەڵدانی توندوتیژی ناوبراو بە (جیهادییە ئیسلامییەکان) لە وڵاتی میسر سەریهەڵداو بەتایبەتی دوای تێکچوونی خەتی ئیسلامی سیاسی لەگەڵ جەمال عەبدولناسر و ئیتر لەوەوە گرووپی هەمەجۆرەی ئیسلامی توندڕەو لە زۆر شوێنی دی سەریهەڵدا هەتاکوو گەیشتن بە سەرهەڵدانی (القاعده) و هاوشانەکانی لە زۆر ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ڕاستەخۆ ئەڵێین هوکاری تەشەنەکردنی ئەو توندڕەوییە سێ شت بوو کە تائێستا هەمان ئەوە ڕۆڵی هەیە لە بڵاوبوونەوەی:

یەکەم: ڕژێمەکانی ناوچەکە تا خۆیان وانیشان بدەن لای زلهێزەکانی دنیا گوایە (ئیسلامی نین و عەلمانین..!!) ڕوویان لە دوو کارکرد، یەکەم توند لە سەرچاوە ناوبراو بەجیهادییەکانیاندا و دووەم کوێرانە کەوتنە هاندانی بەرەڵایی ڕەنگاوڕەنگی غەرب لەناو خەڵکی وڵاتەکانیاندا بێ ئەوەی حسابی ورد بۆ نەرێت و مێژوو ماناکانی (شارستانیەت و بینای ڕەوشت) لە پەیامە دینییەکان بکەن.

دووەم: زیادەڕۆییان کرد لە ڕازیکردنی زلهێزە خۆسەپێنەرەکاندا کە بووە مایەی ئەوە قۆناغ بەقۆناغ ئیرادەی نیشتمانیی ئەو وڵاتانەی بێ هێزکرد و بەوە خۆسەپاندنی دەرەکی فراوان بو،و کە بەرەنگاری توندڕەوە دینیەکانیان کردە بیانوو بۆ دەستوەردانە کاری ئیرادەی نیشتمانیان.

سێیەم: نەتیجەی یەکەم و دووەم، لە پاڵیا ئەرزیەتی جەهلی گشتیی کۆمەڵایەتی سێ کوچکەی فرست بوون لە بەردەم تاقمە توندڕەوەکاندا لەژێر پەردەی دیندا بۆ خۆقایمکردن و کەسبی پشتیوان لەناو خەڵکدا.

***

لەبیرمە کە ئەم دیاردەیە تەشەنەی کرد و بوو بە ماددەی باس و خواست و شیکردنەوەی هەمەجۆر لە سەرچاوەکانی ڕاگەیاندندا، ڕۆژنامەی (الاهرام)ی بەناوبانگ ڕاپۆرتێکی پڕ زانیاریی وردی بەژمارە و بەڵگەوە بڵاوکردەوە، وەک وەڵامدانەوەی ئەو نووسەر و چاودێرە سیاسییە عەلمانیانەی کە لە شیکردنەوەکانیان بۆ ئەم دیاردەیە خەتایان دەدایە پاڵ خوێندنگا و قوتابخانە و حوجرە دینییەکان کە گوایە ئەو توندڕەوانە لەو شوێنانەوە دێن و بەڕووی ژیانی مەدەنیەتی کۆمەڵدا دەچن و داوایان ئەکرد بە داخستنیان و کەمکردنەوەی دەرسە ئاینییەکان. لەو ڕاپۆرتەدا (الاهرام) بەژمارە و بەڵگە ڕوونیکردەوە کە بە بەراورد بەنیسبەتی ژمارەی ئەو توندڕەوانەی دوایی ڕوویان لە چەک هەڵگرتن کرد بۆ ئاژاوەنانەوە لەژێر پەردەی داکۆکی لە (دین و پەیامەکەی)دا،

که دەرچووی خوێندنە دینییەکان بوون کەمتر لە ١٥٪ بوون بە نیسبەت ئەوانەوە کە یان لە شەقامەوە هاتبوون یان لە خوێندنگا ئاساییە مەدەنیەکانەوە دەرچوون، بەتایبەتی لەوانەی گەیشتن بە پلەی ڕابەرایەتی دیاری ئەو تاقمانە کە لە هیچ خوێندنگایەکی دینی و خوێندنی شەریعە دەرنەچوون: (ئەیمەن زەواهیری میسر دەرچووی کۆلێجی پزیشکی و شارەزا لە نەشتەرگەریی و ئەبو موصعەب زەرقاوی پلەی خوێندنی لە پۆلی دووی ئامادەیی تێنەپەڕی بوو(دەرچووی ئاژاوەی کۆمەڵایەتی شەقام وەک نموونە).

ئەم ئیشارەتە دەکەمە دەستپێکی ڕووناکی خستنە سەر دیاردەیەکی سەرنجڕاکێش لەلای دەستەیەکی بەرچاو لەناو ڕووناکبیرانی سەردەمی ئێمەدا بووە بەخوو کە بریتییە لە (خەتابارکردنی) وجوودی ئیلتیزامی دینی ناو کۆمەڵ لە بوونی هەر دیاردەیەکی دواکەوتوویی یان کێشەی کۆمەڵایەتی تا دەگاتە دیاردەی (ئیرهابی ڕێکخراوە توندڕەوەکان) لەژێر پەردەی جیهاد بۆ داکۆکیکردن لە (دینی ئیسلام و پەیامەکەی)... لەبەرئەوە دەمەوێ بەکراوەیی و بێ گرێی سەبارەت بەمجۆرە (یەخەگرتنی ئیسلام و ڕێوباوەڕی- کە لە ئەدەبیاتی ئیعلامیدا بە – دینوفوبیا ناونراوە) بەوشێوە چڕەی ئێستا هەیە دەربیڕم، بەڵام سەرەتا بۆتان ڕوون ئەکەمەوە ئەم بیروڕایە بەناوی (داعیە – بانگیشەی ئاینی) دەرنابڕم، من هەرچەندە ڕێوڕەسمی ئایینی لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەمدا پەیڕەو ئەکەم، بەڵام ئەمە بە قەناعەتی ڕۆحی تایبەت بەخۆمی ئەزانم و هەتا ئامادەنیم فەرزی بکەم بەسەر نزیکترین کەسمدا کە ئەولاد و نەوەکانمن. مەبەستم لە قسەکردن لەسەر مەوزوعەکە مەترسی ئەو پێداگرتنە کۆکەیە لەسەر (خووی بەدناوکردنی دین بەگشتی و ئیسلام بەتایبەتی) بەشێوەیەکی موبەرمەج لە کۆمەڵێکدا نیسبەتی ئینتیمای بۆ دینە ئاسمانییەکان ئەوەڵیان ئیسلام نزیکە لە ٩٥٪ و لەو نیسبەتە ٤٠٪ یان هەڵسوکەوتی (بەباوڕانە) لەگەڵ شەرع بکەن و نیسبەتی (تخلف – جەهالەت) لەوەی لە ململانێ دەربارەی ئەسڵی خووی یەخەگرتنی دین و شەرع بگاتە ٧٠٪، مانای ئەوەیە (پێ بزانین یان نەزانین) یاریدەی سەرهەڵدانی (کوولانەی داعشیات و قاعیدیات) ئەدەین لەناو کۆمەڵەکەماندا. محەمەد حەسەنین هەیکەلی ڕۆژنامەنووسی هەرە مەشهوری میسر لە نووسینێکیدا ئەڵێ: سەیرم لێ دێ ئەوانەی گوایە ڕۆشنبیرن لەخۆیانەوە ئەچن بەگژ ڕەوتی باوەڕبووان بە دین لەناو کومەڵەکەماندا! ئەوانە هەست بە مەترسی ئەوەناکەن کە باوەڕبوون بە دین لای زۆربەی خەڵکی کۆمەڵەکەمان (هەندێک جار) بەبێ ئەوەی هەستی ڕاستەخۆی پێ بکەن لەژێر پێستی لەشیاندا چەکەرەی کردووە؟

یەکێک لە هەرە پێداویستەکانی سوودوەرگرتن لە (سەربەستی و بیروڕا دەربڕین) تا سوودی هەبێ و جێی خۆی بگرێ ئەوەیە قەناعەتمان هەبێ بەوەی: (سەربەستی یەعنی مەسئولیەت) و بێشک مەسئولیەت لێرەدا یەعنی سەربەستی لە خزمەتی بینای ئیجابی

فیکری ئینساندا بێ. لە ئەوروپا (مولحید/ بێ دین) زۆرن، کەچی نابیستین ئەو مولحیدانە ئیستفزازی ئەو ڕەمزانە بکەن و خۆیان کردبێ بەخاوەن بانگەواز تا ئەوانەی باوڕیان بە دین هەیە بە قسەی ڕەق و جنێو بە دین بدەن و موسا و عیسا و محەمەد بەدناو بکەن (هەندێ جار نەبێ کە ئەچێتەخانەی ململانێی سیاسییەوە).

باوای دابنێین: خوا نییە و پەیام لە ئاسمانەوە نەهاتۆتە خوارەوە، باشە ئەگەر من باوەڕم وا بێت و کەچی شەو ڕۆژ ڕەخنە و قسەی ڕەق ئاڕاستەی ئەوانە بکەم باوەڕیان وایە خوا هەیە و پەیامی ناردووە بۆ بەشەریەت مانای ئەوەیە وەک ڕابەری هیندی (غاندی) ئەڵێ: (من جنێو بە – هیچ – ئەدەم یەعنی جنیو یان ڕەخنە لەشتێ ئەگرم باوەڕم وایە وجوودی نییە!! گەمژەیی نییە ڕەخنە لە ناوجوود بگیرێ ؟!

ئەو کارە خراپانەی بەناوی دینەوە ئەکرێن بەرهەمی ململانێی چاوچنۆکی بەشەرن، نەک ناوەڕۆکی پەیامە ئاسمانییەکان، لە کۆمەڵگە نەگبەتەکەی ئێمەشدا هەندێ لە (عەمامە بەسەرەکان) جەهالەتی خەڵک لە سوودی خۆیان بەکارئەهێنن، ئینجا لە کۆمەڵێکی جاهیلدا ئەو عەمامە بەسەرانە بازاڕیان گەرمە، کە ئێمەش دێین گاڵتە بە قورئان و خوا و محەمەد و عیسا و موسا ئەکەین ئەوانە ئەیکەن بە بیانوو بۆ هاندانی (توندڕەوە جاهلەکان) کە کۆمەڵ هوشیار و چاوکراوە و خوێنەوار بوو (عەمامە بەسەر) ناتوانێت بیخەڵەتێنێ.

کە باس لەم دیاردەیە ئەکەین، نیاز خەڵک بانگکردن نییە بۆ هاتنە سەر ڕێگەی دین، چونکە وەک ئیشارەتماندا ژمارەی ئەوانەی هەستی ئینتیمای دینییان هەیە ئەوەندە کەم نین تا ڕووبکرێتە بانگەشەی هاتنە سەر ڕێگەی دینداری. خوا نوورێکی گەشە، دەروونی ئینسان ڕوون ئەکاتەوە بۆ بینینی ڕاستی، حەقیقەت و ڕووناکیش لای ئینسانی ژیر و هوشیار یەعنی (ئەخلاقی باڵا)، ئەساسی دین و باوەڕبوون بەخوا لای ڕەوشت بەرز پیرۆزە. ئەوەندە خوێنەواریم هەیە سەیری کێشەکانی لە گۆشەی باوەڕبوون بە (گرێکوێرەی پیلانگیڕی) یەوە سەیر نەکەم، بەڵام تێناگەم بۆ ڕووناکبیرەکانمان وەک بڵێی بەدەست ئەنقەست تەنیا بۆ (ڕستە بەمانا سەلبیەکان) لە قورئاندا ئەگەڕێن و بەگاڵتە پێکردنەوە بڵاوی ئەکەینەوە؟ لە قورئاندا بانگەواز و ڕستە و پەندی جوان هەیە خەڵک بانگ ئەکات بۆ هوشیاریی و عەدالەت، خوا پەیامی دینی نەناردووە بۆ سزای مرۆڤ (وماكنا معذبين حتى نبعث رسولا) لە ناردنی پەیامبەرەکاندا نیازمان سزادانی خەڵک نییە (سورەتی الاسرا)...

دەیان نووسەر و بەناو خاوەن فیکری عەلمانی سەدان کتێب و لێکۆڵینەوەیان نووسیوە هەر بەنیازی تانە و تەشەردان لە ڕەوتی ئیسلامی و هەوڵی فراوان بوونی، کە بەلای باوەڕپێبووانی پەیامێکی شارستانی و بیناکاریی و هوشیاری ئینسانە، ئیسلام بەوە تۆمەتبار ئەکەن کە لە هەڵمەتەکانی فتوحاتدا ئەتکی عەرز و ئەرزی ئەو گەلانەیان کردووە

کە ڕوویان تێکردووە، کەچی عەلمانییە دەستبەتاڵەکانی ئێمە خەڵکی مسوڵمان لەو تاوانە هەرە دڕندانە ئاگادار ناکەنەوە کە (ڕزگاریخوازە غەربییەکان) دەرحەق ئەو میللەتانە کردوویان (فتوحاتەکانیان)، هەر بەناوی بڵاوکردنەوەی عەدالەت و سەربەستی بووە! مێژوونووسی ئەڵمانی (ماریا گێرگارد) لە کتێبی (کە سەربازەکان هاتن)دا نووسیویەی ئەڵێ: گەورەترین پەلاماری ئەتککردن دەرحەق ئافرەت لە مێژووی بەشەریەتدا دوای شکاندنی ئەڵەمانیا لە جەنگی دووەمی جیهانیدا ڕوویدا، کاتێک سوپای سوێنخۆرەکان هاتنە ناو ئەڵمانیاوە دوو ملیۆن ئافرەتی ئەڵەمانیان ئەتک کرد، لە زۆربەی شەقامەکانی شارەکاندا لاشەی ئافرەتی گولەبارانکراو فڕێدرابوون، کە لاشەی ئەو ئافرەتانە بوون خۆیان نەداوە بەدەستەوە ئەتک بکرێن!

سەربازەکانی ڕووس زیاتر لە یەک ملیۆن ئافرەتیان ئەتکرد، سەربازەکانی ئەمەریکا ١٩٠ هەزار و ئینگلیزەکان ٤٥ هەزار و فەرەنسییەکان ٥٠ هەزار، هەموو ئەم سەربازانە لەژێر درووشمی ڕزگارکردنی بەشەرییەت لەدەست نازییە شەڕانییەکانی ئەڵمانیا خۆیانکرد بەو وڵاتەدا و بەوەشکایەوە وەحشییانە بەربوونە ئافرەتانی ئەڵمانیا. دواتر نووسەر ئەڵێ: خاوەن هێزە ئافرەت ئەتککەرەکان ئێستا لەژێرئاڵای نەتەوەیەکگرتووەکاندا ئیدعای سەربەستی ئینسانی ئافرەت ئەکەن...

## (٢) قسەکردن لەگەڵ خەڵك بە لووت بەرزی!

ژمارەیەکی بەرچاو لەو خاوەن قەڵەمانەی تانەو تەشەردانیان لە دین کردووەتە بەرنامەی ڕاگەیاندنی ئەوەی گوایە (ئەوان عەلمانین) و نووری هوشیاری بەخەڵک ئەگەیێنن ئەوەڵ هەڵە تێی کەوتوون بە زمانی خەڵکی قسە ناکەن، خۆیان وا ئەبینن کە بۆ نموونە: ئیدوارد سەعید زانای فەلەستینی و بەناوبانگ لە زانستی مەعریفی ئەدەب و فەلسەفەی سەردەم لە جیهاندا یان فۆکویامای ناسراو بە ڕاگەیاندنی کۆتایی مێژوو و ململانێی شارستانییەتەکان و نعوم تۆمسکی شارەزا لە هونەر و زمانناسی و دوایی شیکردنەوەی باری سیاسی سەردەم و خاوەن فیکرەکانی دی سەردەمن! کە زۆربەشیان لەو خاوەن قەڵەمانەی خۆمان کتێبی یان دووانی ئەوانەیان بینیوە و ئیتر خۆیان لە هاوشانی ئەوانەدا ئەبینن و وائەزانن بۆ گۆمەڵگەی ئەوروپایی قسە ئەکەن و کۆمەڵەکەی خۆیان بە موتەخەلیف ئەزانن و هۆکاری تەخەلوفیان خەتای ئینتیمای دینیانە..! لەوە مەترسیدارتر ئەو خاوەن قەڵەمانە ئەیانەوێ وا لە خوێنەوارانی خۆمان بگەیەنن کە مەسەلەی ئینتیمای دین خوویەکە هەر لە ڕۆژهەڵات بەگشتی و کۆمەڵی ئێمە بەتایبەت باوی ماوە و تا بەرەو ڕۆژئاوا بڕۆی ئینتیما بۆ دین لە مستەوای ڕەسمی و خەڵکیدا باوی نامێنێ...

ڕۆژنامەی (ود ستریت جۆرناڵ) لە ڕاپرسییەکی گشتیدا کە ساڵی پار بڵاویکردووتەوە ڕایگەیاندووە کە ٧٢٪ بەریتانییەکان باوەڕیان بە وجوودی (خالق – پەروەردگار) هەیە و لەناو وڵاتانی یەکێتی ئەوروپا ١٠ وڵاتی ئەندامیان لە دەستووریاندا بەڕەسمی دینی مەسیح بە دینی دەوڵەت دادەنێن و زۆربەی بەندەکانی دەستووریان لەبەر ڕووناکی ئاڕاستەکانی دینی مەسیح دارێژراوە و ئاڵای ٢٤ دەوڵەتی ئەوروپا و ڕۆژئاوا ڕەمزی دینی مەسیحیان لە ئاڵاکانیان داناوە.

دەستووری ڕەسمی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لەبەر ڕووناکی ئاڕاستەکانی ئەو دینەدا دارێژراوە و نیسبەتی ٤٧٪ ی خەڵکی ئەمەریکا بەشێوەی ڕۆژانە و بۆنە ئاینییەکان ئەچنە کەنیسە و ڕێوڕەسمی دینی ڕایی ئەکەن...

شیکردنەوەیەکی ڕۆژنامەنووسیم لەبەردەستایە بەناونیشانی (دینی و سیاسی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا: شیکردنەوەی بەراوردی ئەدەبیاتی نوێ – ئامادەکردنی شیما بهالدین و ماجدە ئیبراهیم) باسی ٧ کتێبی نوێ ئەکات لە ئەمەریکا دەرچوون باس لە دین و سیاسەت ئەکەن لە ئەمەریکا و هەر حەوت کتێبەکە لەیەک مەبەستدا یەک ئەگرنەوە: وجوودی پەیوەندی و بەیەکەوە گرێدراوی دین و سیاسەت لە ئەمەریکادا هەیە و کاری پێئەکرێت...)(١) و ساغی ئەکەنەوە کاریگەریی دین لەسەر سیاسەت لە مەسەلە چەسپاوەکانی دیاریکردنی چوارچێوەی سیاسەت و باری کۆمەڵایەتییە لەوێ و هەر ئەوەیشە کاریگەریی هەیە لەسەر پەیوەندی ئیدارەی ئەمەریکا و جیهانی ئیسلامی.

ئەم ڕاستییانە بەڵگەی ئەوەن کە بەپێچەوانەی ئەوەی ئێمە تێگەیشتبووین و سەرەڕای ئەو هەڵمەتە ڕاگەیاندنە چرەی ڕۆژئاوای بە دەستەڵات ئاڕاستەی کۆمەڵی ئێمەی ئەکەن کە (دین جیابێ لە سیاسەت) ئەوان هەموو ئاڕاستەکانیان بۆ سەپاندنی سیاسەتیان لە سەرچاوەی دینی ڕەسمی خۆیانەوە سەرچاوەی گرتووە و کاری بۆ ئەکەن

ئێمە ئاماژە بەم ڕاستییانە ئەدەین بۆ ئەوەی ساغی بکەینەوە کە خاوەن قەڵەمە چالاکەکانی خۆمان کە خوویان بە بەدناوکردنی دینەوەگرتووە و بەهۆکاری کێشەکانی کۆمەڵایەتی ئەزانن، خۆیان بەم هەڵوێستە بە عەلمانی منەوەر ئەزانن ، نە چاک لە عەلمانیەت گەیشتوون و نە زانیاری تەواویان لەسەر ئوسوڵی پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئەوروپا و ئەمەریکا هەیە لەڕووی هەڵسوکەوت لەگەڵ دین. ئەوانە عەلمانیەت بەجۆرێ لە بەرەڵایی ئەزانن، لەکاتێکدا سەرهەڵدانی ئەم ئاڕاستە فیکرییە سەرهەڵدانی چوارچێوەدانانە بۆ مانای سەربەستی کە مانای مەسئولییەتە وەک لەلایەکی دی ئیشارەتمان پێدا..

لەم لایەنەوە (بێگومان دوای ڕەنجێکی سەختی خاوەن فیکرە منەوەرەکانی ئەوروپا کە لە خەباتی ڕزگاربوون لە دەستەڵاتی کەنیسەوە دەستیپێکرد و پێیان دادەگرت:

دەستەڵاتی حوکمرایی بەرپرسیار لە ڕابەری کۆمەڵ بۆ زامنی: گوزەران و بینا و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ئابووری و یاسایی، بەدووربێ لە ئاڕاستەی دینی و ئاڕاستەی دین پەیوەندی بە ئیختیاری ئینسانەوە هەیە چۆن لەبارێکی ڕۆحیدا پەیرەوی ئەو ئاڕاستانە ئەکات بەقەدەر شارەزایم و خوێندنەوەی ئەوەندە توانیبێتم خوێندبێتمەوە نەمبیستوەو نەمبینیوە خاوەن فیکرەکانی بانگکردنی دوورخستنەوەی دین لە کاروباری ڕۆژانەی دەوڵەت بانگی (ئیلحاد)یان کردبێ بەنیشانەوە ئاڕاستە و پێچەوانەکەی ڕاستەو لە هەندێ وەرچەرخاندا پشتیان بە ئاڕاستەی دین و ڕەمزە ڕووناکبینەکانی کەنیسە بەستووە کە پشتیوانیان بوون..

## (٣) مەترسی خووی سەغڵەتکردنی دین لەچیدایە؟

کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی کە ئێمە بەشێکین لێیان چاوی هوشیارییان لەڕێگەی دین و پەیامە ئاسمانییەکانەوە کردەوە، لە وەرچەرخانە مێژووییەکاندا ڕەمزە دینییەکان هەڵگری مەشخەڵی ڕابەرایی کردنی کاروانی بەرەوپێشێوەچوونی کۆمەڵ بوون، لەم کارە پیرۆزەیاندا ڕاسپاردە دینییەکانیان بۆ هۆشیارکردنەوەی خەڵک کردووە بە بەرنامە، ئەگەر بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلام لە کۆمەڵی کوردەواریدا مایەی بەڵا بووبێ ڕابەرانی شۆڕشە ڕزگاریخوازەکانمان کە لە ئوسوڵی دینەوە دەستیانپێکردووە هەر لە شێخ سەعیدی پیرانەوە بۆ شێخ عەبدولسەلام بارزانی و قازی محەمەد و شێخ مەحمودی حەفیدەوە بۆ پیاوە هوشیارەکانی ڕابەرانی ڕووناکبیری و ئەدەبی و مێژوو وەک مەولەوی و نالی و مەحوی و مەلا کاکەحەمە و مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و عەلادین سەجادی و مەسعود محەمەد و....هتد ئەکەونە دووبازنەوە: یان ئەوەتە خوانەخواستە ڕاستگۆ نەبوون لەگەڵ ئیختیاری دین و ئامانجەکانی ڕەوتەکانیاندا یان ئەوەتە دیسان خوانەخواستە لەژێر پەردەی دیندا بەشداربوون لە خەفڵاندنی نەتەوەدا، بێشک نە یەکەمیان و نە دووەمیان بوون، بەچاوپۆشین لە ئەنجامی ڕەنجەکانیان کە بێشک تەوازوونی هێز لە سەردەمەکانیاندا دەوری گێڕاوە هەوڵ و ڕەنجیان کە بەئاڕاستەی ئیماندارانە بووە و ئەوپەڕی ڕاستگۆیانە بووە و تین و تاو و ڕەنجی ئەوان تا ئێستا مانای شانازی ئینتیمای نەتەوەیی ئێمە گەش ئەکەنەوە.

لەجارێ زیاتر و لە چەند نووسینێکدا ئیشارەتم بەوە داوە کە: هەموو هەڵوێستێکی دەستەیەک لە عەلمانیەکانی لای ئێمە کە ڕەنگدانەوەی خۆهەڵکێشانیانە گوایە ڕووناکبیر و عولەمای سەردەمن و لە خۆبەزلزانینیانەوە تانەی ناڕەوا و سووکایەتی بە ئیتیجاهی ئیمانداری لەناو کۆمەڵگەدا ئەکەن، پێ بزانن یان نەزانن (کە زۆربەیان بەداخەوە پێ

ئەزانن) بەوە هۆکاری فراوانبوونی ڕەوتی توندڕەوی گرووپە ئاینییە تەسک بیرەکان ئەبن لە کۆمەڵگەیەکی وەک ئێمە و کۆمەڵانی ئەم ناوچەیە کە تائێستا (خۆشباوەڕیی و تەسکی مەودای هوشیاری خەڵک) وا ئەکات هەڵوێست وەرگرتنی زۆربەی خەڵک لە ڕێی وروژاندنی سۆز و عاتیفەوە ئەبێ، عەلمانییەکانی ئێمە بەتایبەت و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی لەکاتێکدا عەلمانییەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور و ناوچەی خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ژیرانە و هەروەک ڕۆژئاوا هەڵسوکەوت لەگەڵ ڕەسەنایەتی نەریتی خۆیان ئەکەن.

ئەڵێین عەلمانییەکانی لای ئێمە چاوی خۆیان بەڕووی هەموو ڕاستییە ڕەگداکوتاوەکانی نەریتی خۆماڵیاندا ئەنوقێنن و ڕوو لە ڕەواج پەیداکردن بۆ هەر شتێ بەری فیکری ڕۆژئاواییەکانە ئەکەن بەو ناوەوەی ئەوێ سەرچاوەی سەرهەڵدانی عەلمانییەتە و ئەمە بووە ئامانجی سەرەکییان و هەر ئەوان ئەتوانن گەشە بە شارستانیەتی بەشەرییەت بدەن. ژمارەیەکی بەرچاو لە عەلمانییەکانی ئێمە هەر لەگەڵ فێربوونی ئەبجەدیاتی سەرەتایی عەلمانیدا واز لە هەموو فیکر و بەهای ئایینی و ڕەوشتی ئەسڵی ئینتیمای خۆیان ئەهێنن و بانگی ڕووکردنە نیعمەتی فیکری ڕۆژئاوا ئەکەن بۆیە من بە چاوی خۆم (عەلمانی شارم بینی) سەری (ڕێزی) بۆ ئەو کچۆڵەیە نەواند کە لە حیوارێکی تەلەفزیونیدا وتی: (سەیرم لێدێ دایک و باوک واز لە منداڵەکانیان ناهێنن خۆیان دینی خۆیان هەڵبژێرن...!!) دوایی ناڕەزایی دەربڕی بەرامبەر نەریتی مارەبڕینی شەرعی لە هاوسەرگیریدا و داوای لابردنی ئەم کۆتەی کرد.! ئەوانە هۆکارێکی کاریگەرن لە کۆمەڵێکی وەک کۆمەڵی نیمچە خوێنەواری ئێمەدا کار و ئیدعای فیکریان ئەبێتە مایەی سەرهەڵدانی توندڕەو و دەمارگیرەکان، چونکە دەرگاکانی هەوڵی گونجاندنی ئایین و سەردەمی گەشەسەندنی هوشیاری بەشەر دائەخەن کاتێ حساب بۆ نەریت و سیلەی ڕەحم و باری دەروونی بەری ئەو نەریتە بە لاوە ئەنێن و هەوڵی گەشەسەندی بەوجۆرەی لەگەڵ سەردەمی ئێستا بگونجێ نادەن

ڕەوتی عەلمانی لە ئەوروپا یەکەم هەنگاوی بۆ ڕزگارکردنی خەڵک لە زوڵمی ئەو دەسەڵاتانەی کە لە مێژوودا بە (مەحاکمی تەفتیش) ناوبراوە کە لە سەدەی ١٥ بۆ سەرەتای سەدەی حەڤدە بەئاگر و ئاسن و کوشتن و بڕین بەناوی دینەوە حوکمی گەلانی ئەوروپایان ئەکرد، ڕەوتی تێکۆشانی هوشیارانی ئەوروپا لە لایەنی فیکریی و سیاسییەوە سەریهەڵدا بۆ دوورخستنەوەی دەستوەردانی (کەنیسەکان) لە کاروباری سیاسیی و حوکمڕایی کاروباری ڕۆژانەی خەڵکدا لەو ڕۆژەوە عەلمانیەکانی ئەوروپا کاریان بۆ بیناکاری کردووە کە یەکەم هەنگاویان بانگدانیان بوو بۆ سەربەستی ئیختیار لەم مەیدانەدا.

ئەو سەربەستییەی ئێستا لە ئەوروپا هەیە لە لایەنی شارستانیەتی گونجاو لەگەڵ ئارەزووی زۆربەی خەڵک (بەئیختیاری ئاینیشەوە) بەری ڕەنجێکە لە سەدەی شانزەوە گەیشتە بازنەی

ڕێکخستنی کاریگەر بەرەنجی فیکریی و سیاسیی و بیناکاری عەلمانییەکانی ئەوروپا لە وڵاتانی ئەو کیشوەرە سیستەمی دیموکراتی و هەڵبژاردنی سەربەست و ڕاستەوخۆدا دامەزار و هەر (حاکمێ) ماوەی دەستووری حوکمی تەواوکرد بینای حوکمڕایی بەهەموو ئیمتیازەکانییەوە جێدەهێڵی و ئەچێتەماڵەوە، بەکورسیەکەیەوە نانووسێ و نەخشەی کودەتا دانانێ و هەوڵی گۆڕینی حوکم بۆ حوکمی بنەماڵە نادات، کەچی عەلمانییەکانی ئێمە هەندێکیان کەلیمە و مانای عەلمانی لە کتێب و بینینی فیلمی سینەماوە فێر ئەبن، یەکسەر ئەیانەوێ بێنە سەر جادە و نەریتی سەدان ساڵی خەڵکی لە هەموو لایەنەکانی ئایینی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و پەروەردە بەقسەی بریقەدار و سوکایەتیکردن بەنەرێت وەک ئەوروپا لێ بکات، وەک ئەو فەیلەسوفە عەلمانییەی لە تەلەفزیۆنەوە وتی لەچک و سەربەستنی ئافرەت نمووی مێشک ئەوەستێنێ، هەربۆیە داوای سەر ڕووتی ئافرەتانی کورد ئەکات..!! عەلمانی لای ئێمە سەفەرێ ئەکات بۆ ئەوروپا و دێتەوە ئەیەوێ لە کون فەیەکونێکا هەرچی لە ئەوروپا دیویەتی لە کۆمەڵەکەی ئێمەدا بڵاوی بکاتەوە. عەلمانی لای ئێمە لە باسی مێژووی ئیسلامدا تەنیا پێ لەسەر ئەو کوشتن و بڕینە دائەگرێ لەناو بنە ماڵە حوکمڕاکانی ئیسلامدا ڕوویداوە، کەچی نایەوێ خەڵک بزانێ ئەو دیاردەیە تەبیعەتی مرۆڤی چاوچنۆکە لە بنەماڵەیەکی ئیسلامی بێ یان مەسیحی یان جولەکە یان هەتا مولحیدبێ. هێتلەر عەلمانی بوو هەوای دەسەڵاتدارێتی گەیاندییە ئەوەی شەڕێکی هەڵگیرساند دەیان ملیۆن مرۆڤ تیایدا بوو بە قوربانی و زیاتر لە نیوەی ئەوروپای وێران کرد.

ئەو عەلمانیانەش هەروەک (پیاوە ئاینییەکەی دەرباری سوڵتان) نایانەوێ خەڵکی ئاسایی ئاگاداری مێژووی مرۆڤایەتی بن و بەهوشیاری بیخوێننەوە، چونکە ئەزانن کە ئەوسا ڕیسەکەیان ئەبێ بەخووری، ئەوسا خەڵک ئەزانی کە شەڕ و کوشتن و سەربڕینی برا لەلایەن برایەوە تەبیعەتێکی ناشیرینی مرۆڤی چاوچنۆک بووە بەدرێژایی مێژووی بەشەریەت، ئەوەی مێژووی شەڕوشۆڕ لە ژیانی بەشەریەتدا بخوێنێتەوە سەری سووڕ ئەمێنێ کە بە بەڵگەوە مێژوو بۆمان ئەگێڕێتەوە: لەماوەی هەزاران هەزار ساڵی ژیانی مرۆڤ لەسەر ئەرز و بەر لە هاتنە خوارەوەی (صحف الابراهیم و موسی – ژماردەیەکی مێژوویی ئەبینی ئەڵێت بەشەریەت ١٣ ساڵ ژیانی لە شەڕ و یەکتر ڕاوناندا بەسەر بردووە و یەک ساڵ لە ئاشتی و ئارامدا ژیاوە). کەچی ئێستا عەلمانییەکانی لای خۆمان ئەیانەوێ وا لە خەڵک بگەیەنن کە لە هاتنی ئیسلامەوە شەڕ و پێکدادان لەسەر دەسەڵات سەریهەڵداوە، خۆیان لەوە لائەدەن باس لەوە بکەن کە ئەو کارانە لە بنەماڵەکانی ئیمپراتۆرەکانی یۆنان و ڕۆمان و بنەماڵە دەرەبەگەکانی ئەوروپا ڕوویداوە. ئەوەتە ئەوروپا لەڕێی فیلمی سینەماوە کارە ئابڕوبەرەکانی بنەماڵە حوکمڕاکانی وڵاتەکانیان

ئەگێڕنەوە، کە عەلمانییەکانی لای ئێمە کارە ئابڕووبەرەکانی ئەوانە بە سەربەستی ئیختیار لە خەڵکی بەسەزمانی ئێمە ئەگەیەنن!

بەر لە ئیسلام کە پەیامی مەسیح هاتە خوارەوە، بەدەسەڵاتەکانی جوولەکە ئەوانەی باوەڕیان بەو ئاینە نوێیە ئەهێنا سەریان ئەبڕین و نان براویان ئەکردن و ماڵەکانیان ئەسوتاندن، ئەمەیان لە دڵسۆزییەوە بۆ ئاینی موسا نەدەکرد، بەڵکو لەبەرئەوە بووە کە ئەیانزانی گەشەسەندنی ئەو ئاینە تازەیە دەسەڵاتی چاوچنۆکانەی لادانی ئەوان لە پەیامەکەی موسا دوایی پێ ئەهێنێ. سەردەمی مەحاکمی تەفتیش کە بەناوی عیسا و پەیامەکەیەوە بە بووختان حوکمیان ئەکرد هەر جولەکە و ئیسلامێکیان لە ئەورووپا بەردەست بکەوتایە سەریان ئەبڕیی و ڕوویداوە سکی ژنی ئیسلام و جولەکەیان هەڵدڕیوە ئەگەر سکیان پڕبوایە مەلۆتکەکەیان ئەکوشت، ئەورووپاییە ناموسڵمانەکان خۆیان ئەمە ئەگێڕنەوە، کەچی عەلمانییەکانی ئێمە ئەیانەوێ خەڵکی وڵاتەکەیان مێشکیان بەوە پڕبێ کە کوشتن و بڕین لەبەر حوکم وماڵی دنیا سیفەتی ئیسلامە و بەس!!! لە کاتێکدا عەلمانییە ئەورووپاییەکان بزووتنەوەکەیان لەژێر سەرناوی (ئیصلاحی ئایین) دەستپێکرد و خەڵکیان هوشیارکردەوە ئەوەی مەحاکمی تەفتیش ئەیکات پەیامی عیسا و موسا نییە، بەڵکو کردەوەی (پیاوە ئاینییەکانە) کە خۆیان بەسەر حوکم و دەسەڵاتدا سەپاندووە.... عەلمانییەکانی ئێمە لە ڕەسەنایەتی کۆمەڵەکەی خۆیان شارەزا نین و تیاندا هەیە بە شەرمی ئەزانێ مونتەمییە بۆ کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتی!

سەرەتای شەڕی نێوان عیراق و ئێران بوو، ساڵی ١٩٨٠ بۆ نووسینی ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەنووسی بۆ ڕۆژنامەی (هاوکاری) لەسەر کۆلێژی ئادابی زانکۆی سلێمانی هاتم بۆ سلێمانی، لە پرسگەی زانکۆ دانیشتبووم و چاوەڕێم ئەکرد کوڕێکی لاوی پانتۆڵ (جینز) لەبەر کە بەسیمایدا دیاربوو (ئەورووپی هەوابوو!!) لەگەڵ لاوێکی وەک خۆی بەدەنگی بەرز وەک بیەوێ هەموو ئەوانەی لە پرسگەکە دانیشتبوون گوێیان لێی بێ ڕای خۆی بەرامبەر شەڕی عێراق و ئێران دەرئەبڕی کە هاوڕێکەی ترسی خۆیی دەربڕی لەوەی ئەو شەپۆلە ئاینییە توندڕەوەی لە ئێران شای ڕووخاند ڕوو لە ئێمەش بکات، ئەم زۆر بە باوەڕبەخۆبوونەوە دڵنیای ئەکرد کە ئەمە لێرە و لای ئێمە ڕوونادات، لەم حیکایەتە ئەوەی مەبەستمە بەخوێنەری بگەیەنم بۆچوونی ئەو (لاوە هەوا ئەورووپاییی)یە بوو دەربارەی خوێندنەوەی بۆ باری کۆمەڵایەتی لای ئێمە و ڕوانینی بۆ پاشەڕۆژی مەددی ئاینی لە لامان و ناوەڕۆکی ڕووانینەکەیم بیرناچێ وابوو گوایە: (کۆمەڵی ئێمە کراوەیە، خۆی نادات بەدەست حوکمی پیاوانی ئاینییەوە، ئێمە ئێستا لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیستەمداین ‘ئەم شەڕە ئەبڕێتەوە’ لە سەرەتای نەوەدەکاندا و لەم شاری سلێمانییەدا

'بێجگە لە مزگەوتی گەورە' هیچ مزگەوتێ نابینی هەمووی کومەڵانی چالاکی مەدەنی جێگەی ئەگرێتەوە، مزگەوتی گەورەش وەک ئاسەوارێکی مێژوویی ئەمێنێتەوە و بەس!!

هەرچی قسەی ئەو ئەوروپایی هەواییەم بیردێتەوە و بارودۆخی ئیتیجاهی ئایینی لای خۆمان و لە ناوچەکە بەچاو و کاریگەری ئەبینم هەست ئەکەم نەوەی خۆ بە عەلمانی زانی لای ئێمە (بێگومان بەداخەوە) تاچ ڕادەیەک بیر و هوشیان کاڵ و کرچە و لە هەموو شتێکدا هەتا ئەوەی پەیوەندی بە چارەنووسی تێکڕای وڵات و گەلەکانیانەوەهەیە تەنیا دیوی دەرەوەی ئەخوێننەوەوە، بۆیە ئەبینی بەو سەدان ڕێکخراوەی چالاکی مەدەنییەوە لەم هەرێمە هەیە و ئەو هەزاران چالاکوانەی لێیان کۆبوونەتەوە تیاندا هەیە چوار پێنج زمان قسە ئەکات کەچی کاریگەری لەسەر کۆمەڵگەکەی، نیوەی کاریگەری وتارخوێنێکی مزگەوتەکانەوە نییە بە زاناکانیانەوە و بەو وتار خوێنانانەوەش کە لە خانەی پیاوانی ئاینین!!

**خولاصەی کەلام:**

ژیانتان بەڵایە بۆ خۆتان، ئەگەر بەسەریدا زاڵ بوون،
بۆ بەڵای دی بەتواناتر ئەبن/ ئیمام علی

## کتێبەکان ئەمانەن


١. دین و سیاسەت لە ئەمەریکا، نووسینی مایکل کۆریت و جۆلیا میتشل.

٢ – چۆن لە ئوسوڵیەتی برۆستانیەت و ئیفاتجلیکیەت بگەین، نووسینی جۆرج مارسدن.

٣ – ئوسوڵی توندڕەوی – ڕاستڕەوی مەسیحی لە ئەمەریکا.

٤ – پێشەکی لە ئوسولیەتی مەسیحی لە ئەمەریکا و ئەو سەرۆکەی خوا بانگیکرد و گەلی ئەمەریکا دووجار هەڵیبژارد / ئەم کتێبە کۆمەڵێ وتاری توندڕەوی مەسیحییە لە نیوزیک – ئەمەریکا و بەناونیشانی جەنگی ڕەحمەت لە دیرشبیگلی ئەڵەمانی بڵاوبوونەتەوە و باس لەوە ئەکات کە ئیرادەی خوایی بۆشی کوڕی سەرخست بۆ سەرکەوتن بەسەر ڕۆژهەڵاتدا.

٥– کتێبی پیرۆز و ئیستعمار، نووسینی قەشە مایکل بریور.

٦ – وڵاتی خوا /دین لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا/ نووسینی والتر ڕاسیل مید.

٧– گەشانەوەی بروتستانت و ئیفانجلیکیە لە ئەمەریکا و کاریگەریی لەسەر دنیای ئیسلام/ نووسینی د.محەمەد عارفی مالیزی ڕەگەز.

# ئایدیۆلۆژیا ١٩٨٧- ٢٠١٠

## بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە پڕۆژەی (کورد و کوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠- ٢٠١٠)

ئامادەکردن: بوار نوورەدین

**تێبینی:**

تێبینی:

١- بەکاربەری ئەم بیبلیۆگرافیایە، بۆ هەر سەرنج و ڕوونکردنەوەیەک، پێویستە سەیری ژمارەکانی پێشتری گۆڤاری خاڵ بکات.

٢- تەنها بۆ وشەی (ئایدیۆ) گەڕاوین و ئەم ئەنجامانەمان بەدەست هێناوە.

**کورتکراوەکان:**

پ.: پێوانە (بە سانتیمەترە و پانی پێش درێژی نووسراوە)

پ.د.ک.: پارتی دیموکراتی کوردستان

چ.: چاپخانە

چاپ.: نۆرەی چاپ

ژ.: ژمارە

ژ.س.: ژمارەی سپاردن

ژمارەی جێگیری نێودەوڵەتیی کتێب: ISBN: International Standard Book Number

س.: ساڵ

ش.: شوێن

ل.: لاپەڕە

ی.ن.ک.: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

و.: وەزارەت.

؟: هەر زانیارییەکی نادیار و نەزانراو

**یەکەم: بیبلیۆگرافیای کتێبی سەربەخۆ ١٩٩٦-٢٠٠٥**

**١- تورانچێتی- وەدەرکەوتن، ئایدیۆلۆژیا و بەرنامە**

نووسین: زارە ڤاند

وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: ئەبوبەکر خۆشناو

چاپ.: یەکەم، چ.: و. ڕۆشنبیری، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٩٢، س.: ١٩٩٦، ل.:١١٢، پ.:٢٣×١٧

ناوەرۆک: دەربارەی ئەم کتێبە: وەرگێڕ/ توران/ ڕەگ و ڕیشەی پانتورانیزم/ پانتورانیزم لە تورکیا تا دەستووری عوسمانی/ پانتورانیزم دوای دەستووری عوسمانی/ ئایدیۆلۆژیا و خواستەکانی پانتورانیزم/بەرەو پراکتیزەکردنی بەرنامە (ڕیفۆرمی زمان و تازەگەریی ئەدەبی)/ تا شەڕی یەکەمی جیهانی/ پانتورانیزم لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا/ دوای شەڕ وەستان/ پانتورانیزمی ئەمڕۆ/ ناوەرۆک/ ناوی بەرهەمە چاپکراو و چاپ نەکراوەکانی وەرگێڕ.

**٢- کۆماری دیموکراتی- ئایدیۆلۆژی، سترۆکتور، ستراتیژی، تاکتیک و کردەوەکانی/ پارتی کرێکارانی کوردستان** PKK

نووسین: حەمید گەوهەری

چاپ.: یەکەم، چ.: ؟، ش.: ستۆکهۆڵم- سوید، ISBN: ٩١-٦٣٠-٨٦٢٧-٠، س.: ١٩٩٩، ل.:٨٥، پ.:١٥×٢١

ناوەرۆک: ناوەرۆک/ پێشەکی/ سەرەتا/ ئایدیۆلۆژیی (پ.ک.ک)/ پێکهاتنی گرووپی ئایدیۆلۆژیی (پ.ک.ک)/ستراتیژی گرووپی ئایدیۆلۆژیی (پ.ک.ک)/ ستروکتوری گرووپی ئایدیۆلۆژیی ئۆجەلان و (پ.ک.ک)/ گرووپی ئایدیۆلۆژیی (پ.ک.ک) لە پراکتیکدا/ دامەزراندنی (پ.ک.ک)/ کۆماری دیموکراتی/ بەڵگەنامەکان.

**٣- ئایدیۆلۆژیای ژن ئایدیۆلۆژیایەکی کۆمەڵایەتییە**

نووسین: عەبدوڵڵا ئۆج ئالان

وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: نادیار؟

بڵاوکراوەی ناوەندی ڕۆشنگەریی دیموکراسی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠١، ل:١١٠، پ:؟

ناوەرۆک: ڕاستینەی نەتەوایەتیمان لەگەڵ ڕاستینەی ژن و ژیان هەڵدەسەنگێنێ/ ئایدیۆلۆژیای ژن- ئایدیۆلۆژیایەکی کۆمەڵایەتییە/ سەرۆکایەتیی PKK سەرۆکایەتیی ژنی ئازادە/ پیاوێتی واتای خوڵقاندنی جوانی و یەکسانی مەزنە/ جووڵانەوەی ژنان- جووڵانەوەی ئاشتی و دیموکراسییە/ لە ئایدیۆلۆژیای ڕزگاریی ژندا- تیۆری دابڕان.

ئەم کتێبە لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراوە.

**٤- کۆچ و کۆمەڵگاکانی ئایدیۆلۆژیا و کولتوور**

نووسین: نەوزاد مەحموود عەلی

چاپ: یەکەم، چ: پاک، ش: هەولێر، ژ.س: ٩٩، س: ٢٠٠٢، ل:١٣٧، پ:١٤×٢١

ناوەرۆک: پێشەکی/ لە شەش بەشی بێ ناونیشان پێکهاتووە/ سەرچاوەکان/ پاشکۆکان/ فەهرەست.

**٥- ڕۆژهەڵاتناسیی لەنێوان ستراتیژی داگیرکاریی و ئایدیۆلۆژیای ستەمدا**

نووسین: کاوە مستەفا محەممەد هاوڕاز

بڵاوکراوەی (نووسینگەی تەفسیر) لە هەولێر

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٥٦، س: ٢٠٠٢، ل:١١٩، پ:١٦×٢٣

ناوەرۆک: چرپەیەک/ پرۆسەی گۆڕانکاری و ڕۆڵی فیکر/ ڕۆژهەڵاتناسی چییە؟/ مێژووی ڕۆژهەڵاتناسی و دارشتنەوەی زاراوەکان/ قۆناغەکانی چاوتێبڕین لە ڕۆژهەڵات/ ڕۆژهەڵاتناسی و ئیمپریالیزم/ ڕۆژهەڵاتناسی و زایۆنیزم/ کۆنفرانس و کۆبوونەوەی کۆمەڵەکانی ڕۆژهەڵاتناسی/ ڕۆژهەڵاتناسی و کوردناسی/ ڕۆژهەڵاتناسی و مرۆڤناسی/ مرۆڤناسی و ڕێناکردنی ڕووخسار/ لەپشت مرۆڤناسییەوە/ چەند لایەنێکی تری ئەنسرۆپۆلۆژیا/ ڕۆژهەڵاتناسی لە قاڵبی هونەر و ئەدەبیاتدا/ پوختەی توێژینەوە و بڵاوکراوەکانی ڕۆژهەڵاتناسان/ چەند ڕۆژهەڵاتناسێکی دادخواز/ ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەی کە موسڵمان بوون/ دوا ڕاز- ئامانجەکانی ڕۆژهەڵاتناسی/ سەرچاوە و پەراوێزەکان/ پێڕست.

ئەم کتێبە ژمارەی سپاردنی لە ساڵی ٢٠٠٢ وەرگرتووە، بەڵام لە ٢٠٠٣دا چاپکراوە.

**٦- ڕەخنە و ئایدیۆلۆژیا**

نووسین: حەیدەر حاجی خدر

بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریی و ئەدەبیی نما

چاپ: یەکەم، چ: دیلان، ش: هەولێر، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٥، ل:١٢٢، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: خوێنەری بەڕێز/ ناواخن/ هەندێ بابەتی وەک: بەرەیی/ دووبەرەیی-

سەرەتایەک لەبارەی ڕەخنە و ئایدیۆلۆژیا/ تێشیی یەکەم: ڕوونکردنەوەی ڕەخنەکان/ تێشیی دووەم: ئایدیۆلۆژیا و ئەدەب/ سێ بەرەیی (ئایدیۆلۆژیا لە پرۆسەی ڕەخنەگرتندا)/ ڕەفیق حیلمی و هێڵە سەرەتاییەکانی ڕەخنەی ئایدیۆلۆژیی/ د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ و پیادەکردنی پێوەری ئایدیۆلۆژیا لە ڕەخنەدا/ ڕوانگە قۆناغێکی دیکەی نوێکردنەوە- بەرووداهاتنەوەیەکی ئایدیۆلۆژیی/ کاکەی فەللاح یەک پێوەر و دوو هەڵوێستی ناکۆک/ قارەیی/ سەرچاوەکان.

**دووەم: پێڕستکاری ١٩٨٧- ٢٠١٠**

١- دەروازەی گۆڕانی کۆمەڵ

نووسین: بەیاد عەبدولقادر

چاپ: یەکەم، چ: الحوادث، ش: بەغدا، ژ.س: ١١٤٣، س: ١٩٨٧، ل: ١٠٢، پ: ٢٣×١٧

ناوەرۆک: هۆکارەکانی گۆڕانی کۆمەڵ (سروشتی، ژیانزانی، دیمۆگرافی، تەکنۆلۆژی، ئایدیۆلۆژی).

**٢- دیموکراسی ئایدۆلۆژی جەنگی نێوخۆ**

نووسین: حسێن محەممەد عەزیز

بڵاوکراوەی چاپخانەی باران- سوید

چاپ: یەکەم، چ: باران، ش: سوید، ISBN: ٩١-٦٣٠-٢٩١٦-٢، س: ١٩٩٤، ل: ٨٤، پ: ٢٠×١٤

ناوەرۆک: ناوەرۆک/ بەسەرکردنەوەیەک/ دیموکراسی جەنگەڵ/ سێکوچکەی هەڕەشە ئایدیۆلۆژییەکان.

**٣- شیعری سیاسی کوردی- لە باشووری کوردستان لە یەکەم جەنگی گێتی یەوە تا ڕاپەڕینی شەشی ئەیلولی بەردەرکی سەرای شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٠**

نووسین: عەبدوڵڵا عەزیز خالید (ئاگرین)

چاپ: یەکەم، چ:؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ١٩٩٦، ل: ١٤٠، پ: ٢٣×١٧

ناوەرۆک: شیعری سیاسی لە پێناوی پارتایەتی و ئایدیۆلۆژیەتدا لە نێوان چالاکیی سیاسی و کوردایەتیدا.

**٤- یاسا و ماف**

نووسین: کەمال سەعدی

چاپ: یەکەم، چ: و. ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٦٨، س: ١٩٩٧، ل: ٩٦، پ: ٢٣×١٥

ناوەرۆک: یاسا و ئایدیۆلۆژیا.

**٥- شیعر و تەوەر**

نووسین: حەمەسەعید حەسەن

چاپ: یەکەم، چ: ئاپێک، ش: ستۆکهۆڵم، ISBN ٩١-٩٧٢٠٩٧-٦-٧، س: ١٩٩٨، ل: ٢١٤، پ: ٢٠×١٣

ناوەرۆک: شیعر و ئایدیۆلۆژیا.

**٦- کوردانی سەرگەردان و برا موسوڵمانەکانیان**

نووسین: پ. جەمال نەبەز

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: سوارە قەڵادزەییS.K

بڵاوکراوەی ناوەندی ڕاگەیاندنی کۆمەڵەی

خوێندکارانی کوردستان
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ١٥٣، س: ١٩٩٨، ل:١٦٨، پ:١٦×٢٢
ناوەرۆک: خوێندنەوەیەکی کورت: وەرگێڕ (لێرەدا نووسراوە: دوای خوێندنەوەی ئەم بابەتە مێژووییەی پرۆفیسۆر جەمال نەبەز وەک لێکۆڵینەوەیەکی فیکری و فەلسەفی لەگەڵ بەکارهێنانێکی بابەتی ئایدیۆلۆژیکی، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی لێکۆڵەرەوە و پسپۆری ئایینە ئێرانی و ڕۆژهەڵاتییەکان ڕێزدار د.جەمال نەبەز، دوای بەختکردنی کات و خۆخەریککردن بە سەرچاوە مێژووییەکان و گەڕان بە دوای غەزەوات و داگیرکاری ئیسلامی و پێش ئەو سەردەمەش، لێتۆژینەوە لە مێژووی سەرهەڵدانی ئایینە سنسکریتییەکان، لە کوردستان و وڵاتی ئێران و گەڕان بە شوێن بنەمای فەلسەفە جۆربەجۆرەکانی ئەم مەزهەبە سنسکریتیە کۆنانەدا، ویژدانی خستۆتە گەڕ و بۆ مێژوو ئەم بابەتەی هەڵبژاردووە و لە کۆنگرەی ئیسلامی پارتە ئوسولی و سەلەفی و مەزهەبییەکان، لە ئەڵمانیا لە شاری کۆڵن ئەو لێکۆڵینەوەیەی کردووە بە بیر و فەلسەفەی دەستی خۆی بۆ کۆنگرە ئیسلامییەکە، تا لە نزیکەوە زانا موسوڵمانەکان، بەئاگای ڕووداوە مێژووییە بەسەرچووەکان بن و بواری ویژدان بۆ ڕووداوە تاڵ و سوێرەکان بکەن بە دادوەر، لەم ئاڕاستەکردنەشدا، نیگایەک بەسەر ڕۆڵی نەتەوەی کورددا بخشێنن...)/ پێشەکی: پ.د.محەممەد ساڵح گاباری/ لە یەکەم لاپەڕەی چاپی یەکەمدا نووسراوە (ڕاپۆرتێکی زانستییە، ڕێکەوتی ٢١ی مایسی ساڵی ١٩٩٤ لە کۆنگرەی ئیسلامی دووەم بۆ چارەسەرکردنی «کێشەی کورد» لە «Jugendgastehaus» لە شاری کۆلۆنیا «کۆڵن» بەسترا، خوێنراوەتەوە لەسەر داخوازی «یەکێتیی مسوڵمانانی کوردستان» لە ئەڵمانیا) پاشبەندی ژمارە ١ دەربارەی بزووتنەوە ئیسلامییە (ئوسولییەکان) لە نێوان کورد و کوردستاندا.

**تێبینی:**

- کەسێکی تر بە ناوی (تایەر حەمەئەمین) ئەم کتێبەی بە ناوی (بێدەسەڵاتە کوردەکان و برا مسوڵمانەکانیان) وەرگێڕراوە.
- لەم کتێبەدا بۆ ناوی وەرگێڕ تەنها S.K نووسراوە و بەپێی چاپی دووەم، ناوی وەرگێڕ (سوارە قەڵادزەیی)مان ساغ کردووەتەوە.
- لەم چاپەدا، ئاماژە بە نۆبەتی چاپ نەکراوە و لە چاپی دووەمیشدا، نووسراوە چاپی یەکەم؟ هەروەها بەپێی هەر دوو چاپەکە، ناوەرۆکی بۆ نووسراوەتەوە.

**٧- دیموکراسی لە نێوان مۆدێرنێتە و پۆست مۆدێرنێتەدا**

نووسین: مەلا بەختیار
بڵاوکراوەی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ

چاپ: یەکەم، چ: داناز، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٣٣، س: ٢٠٠٠، ل: ٤٢٩، پ: ١٦×٢٢
ناوەرۆک: بەشی هەشتەم: پۆست مۆدێرنێتە و ئەرکەکانی سەردەم/ بەشی نۆیەم: ئاڕاستەکانی هاوچەرخی ئایدیۆلۆژیا.
**تێبینی:** لەسەر بەرگی کتێبەکە و لاپەڕەی یەکەمدا نووسراوە: بابەتەکانی کتێبەکە، ڕەخنەن لە گوتارێکی ڕەخنەیی کاک (ڕێبین ئەحمەد هەردی)، بەڵام لە دووتوێیدا لێکۆڵینەوەیە لەسەر: مۆدێرنێتە، پۆست مۆدێرنێتە، فەلسەفە، سیاسەت، ئیسلامگەرایی، بیروڕاکانی سەدەکانی ناوەڕاست، ئازادیی ڕەخنەسازی و ئەرکەکانی دیموکراسیی نەتەوەیەکی داگیر و دابەشکراو.

**٨- ململانێی شارستانییەکان یان هەژموونێکی نوێی خاچپەرستی؟**
نووسین: کاوە هاوڕاز
بڵاوکراوەی بەشی ڕۆژنامەگەری و بڵاوکردنەوە- مەکتەبی ڕاگەیاندن- بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی- عێراق
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ٢١٤، س: ٢٠٠٠، ل: ٩٥، پ: ١٦×٢٢
ناوەرۆک: لە ململانێی ئایدیۆلۆژیاکانەوە بۆ ململانێی شارستانییەکان.

**٩- چەند ڕاستییەکی مێژوویی شۆڕشی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی و شۆڕشەکانی دیکەی بارزان تا ساڵی ١٩٤٥**
نووسین: مەنسوور شێخ ڕەئووف بەرزنجی
چاپ: یەکەم، چ: خەبات، ش: دهۆک، ژ.س: ٣٤٢، س: ٢٠٠١، ل: ١٦٦، پ: ١٦×٢٢
ناوەرۆک: ئایدیۆلۆژیا و ستراتیژی ئیتیحادییەکان.

**١٠- قادر شۆڕش- چل ساڵ خەبات و تێکۆشان- دیوی ناوەوەی هەندێ لایەنی مێژووی خەباتی نەتەوەی کورد لە نێوان ساڵانی ١٩٤٦- ١٩٨٣دا**
نووسین: شاخەوان شۆڕش
چاپ: دووەم، چ: ؟، ش: کوردستان، ژ.س: ٤٥٨، س: ٢٠٠١، ل: ٢٣٦، پ: ١٤×٢٠
ناوەرۆک: پراکتیک و ئایدیۆلۆژیای بزووتنەوە/ ڕەخنەی سەیدا لە ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیستی زانستی.
تێبینی: چاپی یەکەمی ئەم کتێبە دەزگای (خۆیبوون) لە وڵاتی دانیمارک، ساڵی ٢٠٠١ چاپی کردووە.

**١١- کورد لە سیستەمی نوێی جیهاندا**
نووسین: فەیسەڵ دیهاتی
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: هەولێر، ژ.س: ٥١٨، س: ٢٠٠١، ل: ٢٥٨، پ: ١٥×٢١
ناوەرۆک: چۆن ئایدیۆلۆژیامان ناشت؟

**١٢- لەبارەی دیموکراسییەوە (وەڵامێک بۆ کاک مەلا بەختیار)**
نووسین: ڕێبین هەردی
بڵاوکراوەی چاپخانەی ڕەنج
چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی،

ژ.س.: ١٤٣، س.: ٢٠٠١، ل.:٣٠٢، پ.:١٦×٢٢
ناوەرۆک: ئایدیۆلۆژیا و گۆڤار.

**١٣- ستەمکاری مەملەکەتی ترس و لە مرۆڤ خستنی مرۆڤ و تیرۆرکردنی عەقڵ**
نووسین: فارووق ڕەفیق
بڵاوکراوەی چاپخانەی ڕەنج
چاپ: یەکەم، چ.: ڕەنج، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٢٠١، س.: ٢٠٠٣، ل.:٢٦٥، پ.:١٦×٢٢
ناوەرۆک: بەندی شەشەم: ئایدیۆلۆژیا هەڵگری تۆوی ستەمکاری (تەفسیرێکی هانا ئارێنتی بۆ تۆتالیتاریالیزم).

**١٤- بیری ناسیۆنالیزمی تورکمانی**
نووسین: یوسف گۆران
بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)
چاپ: یەکەم، چ.: ؟، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ١٧٣، س.: ٢٠٠٤، ل.:٨٠، پ.:١١×١٦
ناوەرۆک: ئایدیۆلۆجیای سیاسیی بەرەی تورکمانی.

**١٥- تەعریبی کەرکوک- سیاسەتی تەعریب لە دووتوێی هەشتا بەڵگەنامەدا**
نووسین: شۆڕش حاجی
چاپ: یەکەم، چ.: دارالحکمە، ش.: لەندەن، ISBN: ١-٢٣-٩٠٤٩٢٣-٠-٩-٧، س.: ٢٠٠٤، ل.:٣٠٦، پ.:١٦×٢٢
ناوەرۆک: بەشی دووەم: تەعریب لە ئایدیۆلۆژیای حیزبی بەعسدا.

**١٦- جەڤەنگ د هۆزانا ڕیالیستیکا کوردیدا- دەڤەرا بەهدینان ١٩٧٠-١٩٩١**
نووسین: عیماد وەیسی خالید
چاپ: یەکەم، چ.: و. پەروەردە، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٤١، س.: ٢٠٠٤، ل.:٢٠٥، پ.:١٦×٢٣
ناوەرۆک: ئایدیۆلۆژی.

**١٧- چۆن لە کێشەکانمان بدوێین؟**
نووسین: ئومێد قەرەداغی
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: ؟، چ.: سەردەم، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٤١١، س.: ٢٠٠٤، ل.:١٦٠، پ.:١٤×٢٠
ناوەرۆک: بەشی چوارەم: ئایدیۆلۆژیا و لیبرالیزم.

**١٨- شوناس و ئاڵۆزی- چەند وتارێک دژ بە دۆگماتیزم**
نووسین: ڕێبین هەردی
بڵاوکراوەی نێوەندی ڕەهەند بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی
چاپ: یەکەم، چ.: ڕەنج، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠٠٤، ل.:٢٦٢، پ.:١٧×٢٤
ناوەرۆک: ئایا جوندولئیسلام کۆمەڵێک ڕێبوار و کۆچبەری ئایینیی و ئایدیۆلۆژین؟/ تەقینەوەکانی هەولێر:

چەند سەرنجێک لەسەر ڕەگ و ڕیشە ئایدیۆلۆژییەکانی توندوتیژی لە دنیای ئێمەدا.

**١٩- شیعر و شمشێر- توێژینەوەی ئەدەبی**

نووسین: حەمەسەعید حەسەن

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٥١٥، س: ٢٠٠٤، ل: ١٦٠، پ: ١٤×٢١

ناوەڕۆک: شیعر و ئایدیۆلۆژیا.

**٢٠- گفتوگۆکان- بەشی یەکەم**

ئامادەکردن: شوان ئەحمەد

بڵاوکراوەی هەفتەنامەی سلێمانیی نوێ- سەرۆکایەتیی شارەوانیی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: ژیر، ش: سلێمانی، ژ.س: ٧٨٩، س: ٢٠٠٤، ل: ١٦٤، پ: ١٤×٢٠

ناوەڕۆک: پێنجەم: فەلسەفە- زانست- ئایدیۆلۆژیا: شاهۆ سەعید.

**٢١- ئازادی لە بەهاری تەمەنیدا- وتاری ڕۆژنامەنووسیی**

نووسین: نەژاد عەزیز سورمێ

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٨١، س: ٢٠٠٥، ل: ٢٠٧، پ: ١٢×١٩

ناوەڕۆک: ڕۆژنامەنووسی وەک پیشە- ڕۆژنامەنووسی وەک ئایدیۆلۆژیا.

**٢٢- سۆسیۆلۆژیای شیعری کوردی لەڕووی پێوەرە ئاکارییەکانەوە- نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم**

نووسین: ئازاد عەبدولواحید کەریم

بڵاوکراوەی یەکێتیی نووسەرانی کورد- لقی کەرکووک

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٠٠، س: ٢٠٠٥، ل: ٢٢٣، پ: ١٦×٢٤

ناوەڕۆک: ئەدەب و ئایدیۆلۆژیا.

**٢٣- لێکۆڵینەوەکانی پێش مێژوو لە کوردستانی عێراقدا- بەشی یەکەم**

بە هاوکاری: ڕۆبەرت ج. د- برید وود- برووس هاو

لەلایەن: هانس هەلبیک- فریدیک ئار- ماتسۆن- چارلیس ئی. ڕید- هەربەرت ئی- ڕایت جی ئار

وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: ئاسۆس محەممەد مەلا قادر

بڵاوکراوەی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٦٧٩، س: ٢٠٠٥، ل: ٢٠٨، پ: ١٦٥×٢٣

ناوەڕۆک: خەباتگێڕیی و ئایدیۆلۆژی.

**٢٤- ناسنامەی دەق (ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبییە دەربارەی ناسنامەی نەتەوایەتی و ئیستاتیکی دەق و گوتاری ڕەخنەیی)**

نووسین: د.فوئاد ڕەشید

بڵاوکراوەی یەکێتیی نووسەرانی کورد- لقی کەرکووک

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٩٧، س: ٢٠٠٥، ل:١٢٦، پ:١٥×٢٢
ناوەرۆک: ڕەخنەی بونیادگەری-ئایدیۆلۆژیای دەمامکدار.

**٢٥- ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنێتی- لێکۆڵینەوەی فەلسەفی**
نووسین: نیهاد جامی
بڵاوکراوەی سەنتەری ڕووناکبیریی سەلام
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: کوردستان، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٦، ل:٣٢٢، پ:١٥×٢٠
ناوەرۆک: بەشی دووەم: هەڵوەشاندنەوە/ هەڵوەشاندنەوەی عەقڵ و میتافیزیکیای فەلسەفە/ کۆتایی ئایدیۆلۆژیا و سەرهەڵدانەوەی فەلسەفە.

**٢٦- غەمە جڤاتیەکان- هەڵبژاردەیەک لە لێکۆڵینەوەکانی ١٩٩٥-٢٠٠٠ بەرگی یەکەم**
نووسین: فارووق ڕەفیق
بڵاوکراوەی چاپخانەی ڕەنج
چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ٧٥٩، س: ٢٠٠٦، ل:٤٤٧، پ:١٥×٢٤
ناوەرۆک: ناسیونالیزم وەک هێزێکی ئایدیۆلۆژی.

**٢٧- بەعسیزم و کورد- توێژینەوەیەکی مێژوویی، سیاسییە (١٩٤٧-١٩٥٧)**
نووسین: سۆزان کەریم مستەفا
بڵاوکراوەی مەکیەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)
چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ٥٦، س: ٢٠٠٧، ل:٤٤٢، پ:١٦×٢٤
ناوەرۆک: بنەما ئایدیۆلۆژییەکانی پارتی بەعس.

**٢٨- دیلان و تاقیکردنەوەی شیعری**
نووسین: د.دڵشاد عەلی
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٦٤، س: ٢٠٠٧، ل:٢٦٨، پ:١٦×٢٢
ناوەرۆک: بەشی دووەم: ڕێڕەوی ئایدیۆلۆژی تاقیکردنەوە شیعرییەکانی دیلان.

**٢٩- هەردی و ڕۆمانسیزمی خود**
نووسین: کەمال میراودەلی
بڵاوکراوەی خەندان بۆ پەخش و وەشاندن
چاپ: ؟، چ: (ش.أ.ە)، ش: کەرکووک، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٧، ل:١٩٢، پ:١٦×٢٢
ناوەرۆک: بەشی سێیەم: ئەزموون و ئایدیۆلۆجی.

**٣٠- یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و کورد لە سەردەمی نوێدا**
نووسین: م.أ.حەسرەتیان
وەرگێڕانی لە زمانی ڕووسییەوە: د.دلێر

ئەحمەد
بڵاوکراوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٠٣٢، س: ٢٠٠٧، ل:١٥٨، پ:١٧×٢٤
ناوەرۆک: تورکیا دەستووری ئایدیۆلۆجیا و ئایدیۆلۆجیای دەستوور: د.ڕەفیق سابیر.

**٣١- کورد و کوردستان- لە یەکەم ئەنسیکلۆپیدسای تورکی لە مێژوودا**
نووسین: شەمسەددین سامی
ئامادەکردنی بۆ زمانی تورکی نویَ: م. ئەمین بۆزئەرسلان
وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: ئەحمەد تاقانە
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: هەولێر، ژ.س: ١٠٨٦، س: ٢٠٠٨، ل:٤١٦، پ:١٧×٢٤
ناوەرۆک: کەمالیزم و میساقی میللی/ ئایدیۆلۆژیای سەلاتیک.
تێبینی: ئەم کتێبە لەلایەن (جەلیل محەممەد شەریف)یشەوە وەرگێڕدراوە و ئامادە کراوە.

**٣٢- چرایەک لە تاریکیدا- دیداری نووسەری شەهید (مارف بەرزنجی) لێکۆڵینەوە**
ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان–لقی کەرکوک
چاپ: یەکەم، چ: کوردستان، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٩، ل:١٩٢، پ:١٥×٢١
ناوەرۆک: تراژیدیای پشکۆیەک ئایدیۆلۆژیا و پێکهاتەی دەق لە شیعرەکانی (م.ب)دا: د.ئازاد عەبدولواحید کەریم.

**٣٣- دیالۆگ و داهێنان (کۆمەڵە وتار)**
ئامادەکردن: عەبدولخالق یەعقووبی
بڵاوکراوەی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: خانی، ش: دهۆک، ژ.س: ٥٠٣، س: ٢٠٠٩، ل:٢٣٠، پ:١٦×٢٢
ناوەرۆک: وەرزی دواندن: چیرۆک و ئایدیۆلۆژی.

**٣٤- کاریگەریی مافە سروشتییەکان لە سەرهەڵدانی شۆڕشدا**
نووسین: سەمەد زەنگەنە
بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)
چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٣٠٧، س: ٢٠٠٩، ل:٣١٧، پ:١٥×٢٢
ناوەرۆک: کورد لە گەمەی ئایدیۆلۆژییەکان و مافی بڕیاردانی چارەنووسدا (مارکسیزم وەک نموونە).

**٣٥- کورد پێویستی بە یەک زمانی نووسینی نیشتمانی هەیە**
نووسین: هەندرێن و کامیار سابیر
چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی،

ژ.س.: ١٨٢٩، س.: ٢٠٠٩، ل.:١٥١،
پ.:١٤×٢١
ناوەرۆک: زمانی کوردی لە نێوان ئایدیۆلۆژیا و زمانناسیدا.

**٣٦- مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی- مۆدێرنیتەی دیموکراتی و کێشەکانی تێپەڕاندنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ٢**
نووسین: عەبدوڵڵا ئۆج ئالان
وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: لوقمان عەبدوڵڵا
چاپ.: یەکەم، چ.: ڕەنج، ش.: سلێمانی،
ژ.س.: ٢٣٥٣، س.: ٢٠٠٩، ل.:٤٣٥،
پ.:١٤×٢٠
ناوەرۆک: ئایدیۆلۆژیا و بە ئاییندکردنی شارستانی (مۆدێرنیتە)ی سەرمایەداری/ ئایدیۆلۆژیای یەهودی.
تێبینی: ئەم کتێبانەی ئۆج ئالان چەند جارێک چاپکران و کۆپی کراونەتەوە و هەندێ زانیاریشیان ناتەواوە.

**٣٧- مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی- پەرتووکی سێیەم- سۆسیۆلۆژیای ئازادی- تاقیکردنەوە سەبارەت بە سۆسیۆلۆژیای ئازادی**
نووسین: عەبدوڵڵا ئۆج ئالان
وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: لوقمان عەبدوڵڵا
چاپ.: یەکەم، چ.: ڕەنج، ش.: سلێمانی،
ژ.س.: ٢٣٥٣، س.: ٢٠٠٩، ل.:٤٤٠،
پ.:١٦×٢٣

ناوەرۆک: ئایدیۆلۆژیای یەهودی- سەرمایەداری و مۆدێرنیتە.

**٣٨- مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی- پەرتووکی چوارەم- قەیرانی شارستانی لە خۆرهەڵاتی ناوین و چارەسەری شارستانێتی دیموکراتی**
نووسین: عەبدوڵڵا ئۆج ئالان
وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: لوقمان عەبدوڵڵا
چاپ.: یەکەم، چ.: ڕەنج، ش.: سلێمانی،
ژ.س.: ٢٣٥٣، س.: ٢٠٠٩، ل.:٥١٠،
پ.:١٥×٢٠
ناوەرۆک: کێشەی ئایدیۆلۆژیا و ئابووری لە کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا.
تێبینی: جگە لەوەی ساڵی ٢٠٠٩ ژمارەی سپاردنی وەرگرتووە، ساڵی ٢٠١١یشی لەسەر نووسراوە.

**٣٩- مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتیک- پەرتووکی پێنجەم- کێشەی کورد و ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکراتیک (لە ناو بەرداشی ژینۆسایدی کلتووریدا بەرگریکردن لە کورد)**
نووسین: عەبدوڵڵا ئۆج ئالان
وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: لوقمان عەبدوڵڵا
چاپ.: یەکەم، چ.: ڕەنج، ش.: سلێمانی،
ژ.س.: ٢٣٥٣، س.: ٢٠٠٩، ل.:٦٤٩،
پ.:١٧×٢٣
ناوەرۆک: بەشی چوارەم: بزووتنەوەی

PKK و شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی/ أ- PKK و ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت- نەتەوە.

**٤٠- بەعێراقیکردنەوە یان قوڵبوونەوەی قەیرانی ناسنامە**
نووسین: کاوە نادر قادر
چاپ: یەکەم، چ: منارە، ش: هەولێر، ژ.س: ١٤٦، س: ٢٠١٠، ل: ٣٧٥، پ: ١٦×٢٣
ناوەرۆک: پرۆژەی نەتەوەیی کوردستان لە نێو لێکدانەوەی مافی چارەی خۆنووسیی ڕاگەیەنراوی نێو ئایدیۆلۆژیای فەرمی یەکێتیی سۆڤێتیدا.

**٤١- پیاوانی ئازا، ژنانی جوان؟ جێندەر و توندوتیژی هێمایی لە کۆمەڵگەی شارنشینی کوردستانی عێراق**
نووسین: ئەندریا فیشەر تاهیر
وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد سوڵتان
چاپ: یەکەم، چ: ئاوێنە، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٧١٤، س: ٢٠١٠، ل: ٢٦٤، پ: ١٧×٢٤
ناوەرۆک: نەسکی حەوتەم: ئاهەنگی جوانی/ کچانی خراپ- کورانی باش/ (جوان)ی کوردی/ ئایدیۆلۆژیای جوانی.

## کتێبی بێ ساڵ

٤٢- ڕەهەندەکانی شارستانییەتی دیموکراسییانە- زنجیرە بابەت
ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: ناوەندی ڕاگەیاندنی PÇDK
چاپ: یەکەم، چ: ئازادی، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ؟، ل: ١٣٠، پ: ؟
ناوەرۆک: بەرگرینامەکەی سەرۆک ئاپۆ ئایدیۆلۆژیایەکی نوێیە: عوسمان ئۆجەلان.

# عەبدولحەمید حەمدی بەگی بابان

## وەرگێڕی نێو کۆشکی سوڵتان

د.هێمن عومەر خۆشناو

لەنێو پادشاکانی باباندا ناوی ئاوڕەحمان پاشا و ئەحمەد پاشای بابان بە پشتیوانی فەقێ و مەدرەسە و زانا و کتێب هێنراوە، بەڵام زۆر بە کەمیی لەنێو ژیاننامەی میرانی بابان، کەسانی نووسەر و وەرگێڕ دەبینرێن، ئەم زانایەمان یەکێکە لە وەرگێڕە دیارەکانی نێو فەرمانگەی وەرگێڕان لە دەوڵەتی عوسمانی، وێڕای ئەوەش نامیلکەیەکی ئەحمەد فائیز بەرزنجی لە عەرەبییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی تورکی.

دوای بەدواداچوونمان لەنێو ئەرشیڤخانەی عوسمانیدا چەند بەڵگەنامەیەک بەرچاو کەوتن، لە زۆربەیان جەخت لەوە کراوەتەوە کە ناوبراو وەرگێڕی زمانەکانی عەرەبی و فارسی بووە لە فەرمانگەی مابەین هومایۆنی عوسمانی[1]. بەشێکی دیاری زانایانی کورد کە چوونەتە ئەستەنبوڵ یان بوونەتە مامۆستای زمانی فارسی و عەرەبی، یان بوونەتە وەرگێڕی ئەو دوو زمانە. ڕەنگە یەکێک لە هۆکارەکان ئەوە بووبێ کە تورکەکان کەمتر لەو دوو زمانە شارەزا بوونە و پابەندبوونی مەلا و مودەڕیسانی کورد لە فێربوونی ئەو دوو زمانە و نزیکیی خەڵکی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سنووری فارس و عەرەب هۆکارێکی دیکەی سوارچاکییان بووبێ لەو زمانانە.

دوای ڕووخانی ئەمارەتی بابان،ماڵبات و خانەدانانی بابان پەرش و بڵاو بوون و هەندێکیان لە نوێوە پلەوپایەی دەوڵەتی عوسمانییان لە شوێنە جیاوازەکانی ئەو ئیمپراتۆرییەتە وەرگرت. ئەم بەگزادەیەی بابان (وەک ئەوەی ئێمە ئاگاداربین) یەکەم جارە ناوی دەدۆزرێتەوە، کە بەگوێرەی چەند بەڵگەنامەیەکی عوسمانی ژیاننامەکەی بەم شێوەیەی خوارەوە هاتووە:

---

١ مابەین هومایۆن دامەزراوەیەک بوو وەک ئۆفیسی سکرتێری تایبەتی سوڵتان وا بوو لە کۆشکدا، ئەم دامەزراوەیە بەتایبەتی لە سەدەی نۆزدەدا گرنگییەکی زۆری پێ درا. دامەزراوەکە ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی خەڵک و بابی عالی ڕێکدەخست و پرۆتۆکۆلی سەردانی سەردانیکەرانی بۆ کۆشک بەڕێوە دەبرد. بەتایبەتی لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا بەهێزترین دامەزراوەی دەوڵەت بوو.

عەبدولحەمید حەمدی بەگ کوڕی ئەمین بەگی بابانە[٢]، کە لە بنەماڵەی سلێمان پاشای بابانن. لە ساڵی ١٢٧٥ی کۆچی (١٨٥٨-١٨٥٩ز) لە حیللەی سەر بە ویلایەتی بەغدا لەدایکبووە، زانستە سەرەتاییەکان و مەکتەبی ڕوشدییەی لە بەغدا خوێندووە، لە ٨ی جەمادای دووەمی ١٢٩١ (١٨٧٤/٧/٢٣ز) بڕوانامەی بە پلەی یەکەم وەرگرتووە. هەتا ساڵی ١٢٩٨ لە مەدرەسەکانی بەغداد و سلێمانییە و حەیدەرخانە خوێندنی تەواو کردووە. زمانەکانی تورکی و عەرەبی و فارسی و کوردی بە نووسین و قسەکردن زانیوە و ئاشنای زمانی فەڕەنسیش بووە. لە مانگی شەعبانی ١٢٩١ و لە تەمەنی شازدە ساڵیدا بە مووچەی ١٥٠ قڕووش لە دائیرەی ئیستئینافی بەغدا دامەزراوە. لە مانگی ڕەبیعی دووەمی ١٢٩٤ چل قڕووش مووچەکەی زیاد بووە و لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ١٢٩٦دا بە مووچەی ٧٠٠ قڕووش بۆتە جێگری مەکتوبچی لە ویلایەتی بەصرە و هەمان ساڵ سەد قڕووش مووچەکەی زیادکراوە، دواتر لە هەمان ساڵدا (مانگی ٨ی ساڵی ١٨٧٩ز) و لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا هاتووەتە ئەستەنبوڵ و لە مانگی شەعبانی ١٢٩٧ی کۆچی گوازراوەتەوە بۆ ژووری وەرگێڕان لە بابی عالی و لە هەمان ساڵدا و لە مانگی شەوالدا مووچەکەی دووسەد قڕووش و لە مانگی ڕەبیعی دووەمی ١٢٩٨ی کۆچیدا و دوو ساڵ دواتریش ١٥٠ قڕووش مووچەکەی بۆ زیادکراوە، و بە هەر سێ ساڵەکە ٦٠٠ قڕووشی بۆ زیادکراوە. لە ژووری وەرگێڕانی بابی عالی بووە، ئەوراقی عەرەبی و فارسی تەرجەمە کردووە و بەوهۆیەوە زیادەی بۆ سەر مووچەکە کراوە.

لە مانگی ڕەمەزانی ١٣٠٠ ڕوتبەی دووەم و سنفی دووەمی پێ عەتا کراوە و لە مانگی دوازدەی ١٣٠٢ (ئەیلولی ١٨٨٥ز) چوارەمین ڕوتبەی بە نیشانی مەجیدی پێ کەرەم کراوە. لە ١٠ی موحەرەمی ١٣٠٦ی کۆچی لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە روتبەی سێیەمی شیر و خورشیدی پێ بەخشراوە.

---

٢ لەبارەی ئەمین بەگی کوڕی سلێمان پاشای بابان چەند بەڵگەنامەیەکی عوسمانی دەبینرێن، ئەوەی گرنگە لێرەدا باسی بکەین کە بۆ یەکەم جارە باس دەکرێ، بریتییە لە مێژووی مردنی ئەمین بەگ، بەپێی بەڵگەنامەیەکی عوسمانی ناوبراو لە ٢٦ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٣١٠ی ڕۆمی (١٨٩٤/١١/٧ز) کۆچی دوایی کردووە. لە بەڵگەنامەکەدا ئاماژە بەوە دراوە کە وێڕای حەمدی بەگی کوڕی، کچەکانی بە ناوەکانی فاتیمە و عائیشە، هەروەها نەفعە خانمی خێزانی لە دوای مردنی ماون و پێویستە لە موڵک و ماڵەکەی شاری حیللەی، میراتەکەی بەسەر منداڵ خێزانەکەی دابەش بکرێ. لە بەڵگەنامەکەدا بڕی پارەی تەرخانکراو بۆ خێزان و منداڵەکانی دیارکراوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (BEO.٠٠١,٠٤٩٤٤٣,٠٠٠٦٦٠).

لە ژیاننامەکەدا هەتا مێژووی ٣ی مارتی ١٣٢١ی ڕۆمی (١٩٠٥/٣/١٦ز) لە ژیاندا بووە، دواتر هیچ زانیارییەکی دیکەی نەداوە[٣].

لەنێو بەڵگەنامەکاندا هەر لەو چەند ساڵەدا ناوێکی دیکەی (بابانزادە حەمدی) هاتووە، کە بەتەواوی بۆمان ساغ نەبووەتەوە خۆیەتی یان کەسێکی دیکەی ئەو بنەماڵەیە. بەڵگەنامەکە مێژووی ١٣٢٨/٢/٨ی کۆچی (١٩١٠/٢/١٩ز) لەسەرە، تێیدا ئاماژە بەوە کراوە مۆڵەتی بەکارهێنانی ئەو برە پارەیەی کە پێویستە بۆ چاککردنەوەی ڕێگای حەج کە لەلایەن بابانزادە حەمدی بەگەوە لە (هیت)ی عێراقەوە بەڕێوە دەبرێن کە بەهۆی خراپی ڕێگەکە لەو ناوچەیەی بەناوی موسەییەب هەڵکەوتوو لەنێوان دێر و سەیحە دایە[٤]. لەمەدا دەردەکەوێت کە بابانزادە حەمدی بەگ (ئەگەر هەمان ئەو حەمدی بەگە بێ) ئەوا ئەو کاتە بەڵێندەر بووە و سەرپەرشتی چاککردنەوەی ڕێگەی ئۆتۆمبێلی کردووە.

حەمدی بەگ و وەرگێڕانی کتێب

ئەم حەمدی بەگە هەر تەنیا وەرگێڕی ڕەسمیی دەوڵەت نەبووە، بەڵکو کتێبێکیشی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی تورکی. سەبارەت بە بەرهەمە وەرگێڕانەکەی، لە کتێبخانەی زانکۆی ئەستەنبوڵ، بەشی کتێبی دەستخەت، دەستخەتێکی ٢٤ لاپەڕەیی بە ژمارە (٩٩١٣) هەیە، کە لە پێشەکییەکەیدا بەمە دەستپێدەکات: الحمد الذی فی السماء ذکره وسبحانه، وفی الارض سلطانه وسطواته، المدیر للملك والملکوت بلاوزیر، المرتب لصفوف...

هەر لە پێشەکییەکەدا بە تورکی دەنووسێ کە بەندەی هەژار و پڕ لە کەموکوڕی عەبدولحەمید حەمدی بابان وەرگێڕ لە مابەینی هومایۆن، بەرهەمێکی ئەحمەد فائیز ئەفەندی زانای گەورە و پڕ بەرهەمی وەرگێڕاوە کە ناوبراو لە ساداتانی کیرام و نائیبی ویلایەتی قەستەمۆنە، بەرهەمەکە بە زمانی عەرەبی بووە و ناوی (نص القرآن فی وجوب اطاعة السلطان)ە، لەبەر ئەوەی ریسالەیەکی زۆر بەسوودە و بۆ ئەوەی خەڵکی تورک زوبانیش سوودی لێ ببینین، بۆ زمانی عوسمانیمان وەرگێڕا و ناومان لێنا (اوضح البیان فی وجوب اطاعة السلطان).

3 HR.SAİD.00002.00012.001

4 DH.MUİ.00040.2.00008.001

بەرهەمەکە هێشتا دەستخەتە و ئێمە بە چاپکراوی نەماندیوە و ڕەنگە بۆی نەلوابێ کە چاپی بکات.


**سەرچاوەکان:**

کۆدی بەڵگەنامەکانی عوسمانی:

HR.SAİD.00002.00012.001
DH.MUİ.00040.2.00008.001
BEO.000660.049443.001

هۆشیاری چەند ڕەهەندێکی سەرەکی هەیە و هەموویان پێکەوە گرێدراون و بەردەوام لە گەشەسەندن و پەرەسەندندان، گرنگترین ڕەهەندەکانیشی بریتین لە:

## یەکەم: مرۆڤناسی و خودناسی (فەلسەفەی وجوود)

فەلسەفە جیاوازەکان دید و بۆچوونی جیاوازیان هەیە بۆ ڕەهەندی مرۆڤناسی و خودناسی، بەپێی نزیکی و دوورییان لە ئایین و ئیمان و یەکتاپەرستی و باوەڕبوون بە مەنزومەی تەواوکاری کە بریتییە لە: خالیق و مەخلوق و ژیان و مردن و زیندووبوونەوە، بەڵام هەموو مرۆڤ و مرۆڤایەتی بەگشتی و بە دید و فەلسەفە جیاوازەکانەوە بەشێوەیەکی گشتی کۆک و هاودەنگ و هاوبیر و ڕان لەسەر کۆمەڵێک بەها و پرەنسیپ بەشێوەیەکی لاشعووری، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە خودی مرۆڤ وەک مەخلوقێک - دروستکراوێک بۆ ئامانجێکی دیاریکراو کە دێتە دونیاوە هەموویان بە سێ خەسڵەت و تایبەتمەندی هاوبەشەوە لەدایک دەبن:

**یەکەم: ڕۆحی هەموو مرۆڤەکان وەک یەکە.**

**دووەم: ئیمانی فیطری کە هەڵگری ناسینەوەی چاکە و خراپەیە وەکوو یەکە.**

**سێیەم: عەقڵ و ژیری مرۆڤ لە بنەڕەتدا هەموویان وەک یەکن.**

ئەی ئامانج و مەبەستە دیاریکراوەکە چییە کە مرۆڤایەتی لەسەری کۆکن؟ ئامانج و مەبەستە دیاریکراوەکە کە مرۆڤی بۆ خوڵقێنراوە و لاشعووری بەردەام کاری بۆ دەکات بریتییە لە ئەنجامدانی بەرپرسیارێتی لە بەرامبەر ئەرکی ئاوەدانکردنەوەی زەویی و ئەم دونیایەی مرۆڤ تێیدا دەخوڵقێ و دەژی و هەوڵ دەدات و ڕۆڵ دەبینێت و کۆچی دوایی دەکات.

چۆن هەموو مرۆڤەکان لەو سێ خەسڵەتەدا کاتێک لە دایک دەبن وەک یەکن؟ مرۆڤ کاتێک بە ساغڵەمی و تەندروستیی و ژیرییەوە لەدایک دەبێت، ئیدی ڕۆحی ئەو مرۆڤە لە هەر جێگایەک و لە هەر نەژادێک بێت جیاوازی نییە لە مرۆڤەکانی پێش خۆی و ئەوانەش لە دوای ئەو لەدایک دەبن، چونکە ئەو ڕۆحەی کە ئەمرێکی خودابیە جیاوازی لە شێوازی ئەمرەکەیدا نییە، واتە هیچ کەسێک بە ڕۆحی ناتەواو، یان ڕۆحی پیس لەدایک نابێت.

بە هەمان شێوەی ڕۆح، مرۆڤەکان وەک یەک هەڵگری باوەڕ و ئیمانێکی فیطرین و کەس بەبێ باوەڕی لەدایک نابێت، نەک هەر ئەوەندەش، بەڵکو ئەو ڕۆحە ئەو ئیمانە فیطرییە هەڵگر و گوازەرەوەی کۆمەڵێک خەسڵەتی جوان و کۆمەڵێک بەهای باڵا و بەرزن لە ناخی مرۆڤدا کاریگەری بەردەوامیان هەیە... خەسڵەتی سێیەمیش کە مرۆڤەکان لە بنەڕەتدا و لە کاتی لەدایک بوون خوڵقاندن تێیدا وەک یەکن و هیچ جیاوازییەکیان نییە، ئەویش عەقڵە.

## قسەیەک لەسەر عەقڵ:

مرۆڤ کە لەدایک دەبێت بە عەقڵێکی بێ ئەزموونەوە دێتە دونیاوە، پاشان گەشەکردنی ئەو عەقڵە و شێوازی ئیشپێکردنی پەیوەستە بەو ژینگانەوە کە تێیدا گەورە دەبێت و پێیدا تێدەپەڕێت وەک ژینگەی دایک، باوک، خێزان، کۆڵان، قوتابخانە، کۆمەڵگە، دونیا، ئەزموونەکان و هەوڵەکان و شکست و سەرکەوتنەکان، بینین و ژیان لە نێو کلتوور و نەتەوە و ژیارە جیاوازەکان.

نموونەیەکی کرداری و ئاشکرا کە ڕۆژانە لەسەر ئاستی تاک بە شێوازی جیاواز دووبارە دەبێتەوە:

ئەگەر لەنێو گەل و وڵاتێکی زۆر دواکەوتوودا لە هەموو ئاستەکانی خوێندەواریی و کۆمەڵایەتی و سیاسیی و ئابووریی و حکومڕانی و ئیدارییەوە کۆتا پلەی هەموو دونیا بێت ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی پسپۆڕ لەڕووی زانستی کۆمەڵناسیی و مرۆڤناسیی و دەروونناسییەوە بچێت لەو وڵاتە زۆر دواکەوتووەدا (١٠) دە منداڵی شیرە خۆری کۆرپەلە لە (١٠) دە خێزانی ئاست نزمدا کۆبکاتەوە و وەک نموونە و سامپڵ یەکێکیان جیاکاتەوە و بیخاتە ژێر چاودێرییەوە بۆماوەی (٢٥) بیست و پێنج ساڵ و (٩) نۆ منداڵەکەی دیکەش بگوازێتەوە بۆ (٩) شاری جیاواز، وەک: واشنتۆن، لەندەن، بەرلین، تۆکیۆ، کۆریا، ئەنکەرە، کوالالامپوور و پەکین.

ئەم (٩) منداڵەش لەو (٩) شارەدا بۆماوەی (٢٥) بیست و پێنج ساڵ وەک هاووڵاتی خۆیان بەخێویان بکەن و بە هەموو سیستەمەکانی پەروەدە و فێرکردندا تێپەڕن، پاش (٢٥) بیست و پێنج ساڵەکە هەر (٩) نۆ منداڵەکە کە خوێندنیان تەواو کردووە کۆیان بکاتەوە لەگەڵ ئەو منداڵەی کە بەجێی هێشت و ئێستا ئەویش تەمەنی (٢٥) بیست و پێنج ساڵە و لە ژینگەی وڵاتەکەی خۆیدا گەورە بووە، ئەندامێکی پەروەردەکراوی ئەو ژینگەی خۆیەتی لەڕووی عەقڵی و دەروونیی و سۆزداریی و ئەخلاقی و زانستی و پەروەردەییەوە، بێگومان ئەگەر بەراوردێکی سەرەتایی و سەرپێی بکەین تەنها لە ڕواڵەتی مرۆڤبووندا لە یەک دەچن، بەڵام (٩) نۆ کەسەکەی دیکە جیاوازییەکانیان ڕێژەیی و پلە بەندیەکانیان لە هەندێ باردا وەک یەکن و لە هەندێکدا بە پلەی کەم لە یەکتر جیاوازن و هۆکاری جیاوازییەکانیشیان ناگەڕێتەوە بۆ خودی (٩) کەسەکە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ جاوازی لە سیستەمی پەروەردە و پێگەیاندن و تەندروستی و سیاسیی و بەڕێوەبردن و ئیدارەی وڵات و ئازادی و هاوڵاتی بوون، ئەم ئۆرگان و بەهایانە لە وڵاتەکەی منداڵی یەکەمدا بوونی نییە و ئەویش لەوێدا گەورە بووە و پێگەیشتووە، کەواتە بەو پێودانگەی

ئاماژەمان پێدا مرۆڤەکان لە بنەڕەتی بوون و وجوود و خوڵقاندندا هیچ جیاوازییەکیان نییە، بەڵکو ئەوە ژینگە و سیستەمە جیاوازەکانە تاک و کۆمەڵگە پەروەدە و ئامادە دەکات بۆ ژیان و ڕۆڵ بینین و هەستان بە بەرپرسیارێتییەکان.

هەر کات هۆشیاری تاک لێرەوە دەستپێکرد و دەسەڵات و بیرمەند و فەیلەسوف و ڕۆشنبیران و هاوبیر و هاوکار و هاودەنگ بوون، ئیدی هۆشیاریی دەستەجەمعی سەرهەڵدەدات و بەربەست و بەستەڵەکەکان دەڕوخێنن و دەتوێنەوە و گۆڕان و گۆڕانکاریی و پێشکەوتن دەستپێدەکات، دواجار کە خودناسی و مرۆڤناسی بوو بە بەشێک لە هۆشیاریی و ڕۆشنبیری تاک و دەستەجەمعی چیدی تاک و کۆمەڵگە بودەڵەیی و دەستەپاچەیی قەبوڵ ناکات و هەوڵەکانی چڕ دەکاتەوە بۆ ڕزگاربوون لە هەموو جۆرە بەربەستێک.

لێرەدا بۆ بەرچاوڕوونی زیاتر دوو نموونە لە مێژووی کۆن و نوێ ئاماژە پێ دەکەین لەسەر کاریگەری خودناسی و مرۆڤناسی لەسەر هۆشیاریی و کاریگەری هۆشیاری لەسەر گۆڕان و گۆڕانگاریی و پێشکەوتن.

نموونەی یەکەم، کاتێک نوێنەری مەدینە دەچێتە لای پاشای دەوڵەتی ساسانی و پەیامی فەرمی دەداتە دەستی، کیسرا لێی دەپرسێت ئێوە کێن و چین و بۆچی هاتوون؟

نوێنەرەکە نووسخەیەک لە قورئان و نوسخەیەک لە سوننەتی پێ نادات و هیچ ئایەت و حەدیسێکیشی بۆ ناخوێنێتەوە، بەڵکو دەڵێت: ((ئێمە هاتووین خەڵک و مرۆڤ لە بەندایەتیکردنی بەندە ڕزگارکەین بۆئەوەی ببنە بەندەی خودای تاکوو تەنها، هەروەها دەمانەوێت خەڵک لە جەور و زوڵمی ئەدیان ڕزگارکەین بەرەو دادپەروەریی و سەماحەتی ئیسلام، ئەگەر ئێوە ئەم پەیامە پەسەند و قبووڵ بکەن دەسەڵات و بەرپرسیارێتی وڵاتەکەتان و خەڵکەکەتان لای خۆتان دەمێنێتەوە)).

کیسرا زۆر بە باشی تێگەیشت ئەگەر بانگەوازی یەکتاپەرستی و قبوڵنەکردنی کۆیلایەتی بڵاوبێتەوە ئیدی خەڵک ئازاد دەبن و دەسەڵاتەکەی ئەو کە لەسەر ئەو بنەمایانە دامەزراوە سیحرەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بۆیە نامەکەی دڕاند و پەیامەکەی فەرامۆش کرد، بەڵام دەرئەنجام ئەم هەواڵە و ئەم دایلۆگە کە بڵاوبوویەوە کاریگەری دروست کرد لەسەر نەتەوەی فارس و کورد و هەموو ئەو نەتەوانەی دیکە کە لەژێر دەسەڵات و زوڵمی دەوڵەتی ساسانییەکاندا بوون، سەدان ساڵ بوو دەیانناڵاند و خەویان بە ئازادییەوە دەبینی، هەر ئەوەشە نهێنی زوو بڵاوبوونەوەی یەکتاپەرستی و ئازادکردنی عەقڵەکان لە مرۆڤپەرستی و ئاگر و دار و بەردپەرستی، ئەوە پەیام و پرەنسیپ و بەها

باڵاكان بوو توانی لە ماوەیەكی قیاسی زۆر كەمدا دوو ئیمپراتۆرییەت بەچۆكدا بهێنێت، نەوەک هێزی شیر و تیر و كۆمەڵێک پاڵەوان، ئەگەر پەیامی یەكتاپەرستی و هەڵگرتنی زوڵم لەسەر خەڵک و گەڕانەوەی كەرامەت بۆ مرۆڤ نەبووایە هەموو سوپای ئیسلام بریتی بوایە لە نموونەی خالید و قەعقاع نەیاندەتوانی زاڵ بن بەسەر سوپای هەزار ساڵەی فارس و ڕۆمدا بەو هەموو چەک و جبەخانە و ئەزموونەی كە هەیانبوو.

لێرەدا دەزانین گەورەكردنی پاڵەوان لەسەر حسابی پرەسیپ و بەها باڵاكان و گەڕانەوەی مافی یەكتاپەرستی بۆ خودا و مافی ئازادیی و كەرامەت بۆ مرۆڤ، زیانێكی زۆری بە فیكری ئیسلامیی و مێژووی ئیسلامی و هۆشیاری ئیسلامی گەیاندووە، هەربۆیە ئەوەندەی باسی فەتحی ئیسلامی و پاڵەوانەكانی كراوە و دەكرێت ئەوەندە باسی پەیام و پرەنسیپ و بەها باڵاكانی نەكراوە و ناكرێت.

نموونەی دووەم، لە مێژووی نوێدا لە سەدەی هەژدەوە تا سەدەی بیست ئەورووپا پاش تێپەڕبوونی بە چەندین سەدەی تاریک و خویناویی و سەدان جۆر مەرگەسات و ڕەشەكوژیی و كۆكوژی، ئیدی بیرمەند و فەیلەسوفانیان پاش هەوڵی بێوچان و هۆشیاركردنەوەی بەردەوامیان بۆ تاک و كۆی هاوڵاتیان و قوربانیدانێكی زۆر بە زانا ڕۆشنبیرەكانیان لە كۆتاییدا خودناسی و مرۆڤناسی و كەرامەتی مرۆڤ و دونیابینییەكی نوێ و ڕاست و دروستیان بۆ دروست بوو و سەری لە جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤ و كۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی پیاوانی كەنیسەوە دەرچوو، دواجار لە دوای جەنگی یەكەم و دووەمی جیهانی كە هۆكاری سەرەكی بریتی بوو لە مانەوەی ماک و بنكڕ و بەڵخی قین و ڕق و كلتووری سەقەتی حكومڕانی و خودپەسەندی، پاش ئەو دوو جەنگە پڕكاولكارییە ئەورووپییەكان و خۆرئاوا بەگشتی گەیشتنە ئەو قەناعەتەی ک مافی مرۆڤ و مرۆڤناسی و خودناسی و كەرامەتی مرۆڤ و دەسەڵاتی تاک و هاوڵاتی میكانیزمەكانی دەستوور و یاسا ڕاپرسی بە هاوڵایان بكاتە بنەڕەت و پێوەر و حاكم و دەسەڵاتدار، و دەسەڵاتی سیاسی و سەربازیش خزمەتكار و پارێزەری وڵات بن و دیموكراسی و مافی مرۆڤ پەناگە و مەرجەعی كۆتایی بن، لە ساڵی ١٩٤٨وە و پاش دروستكردنی ڕێكخراوی نەتەوەیەكگرتووەكان و دەزگا نێودەوڵەتییەكانی دیكە ئەورووپا و ڕۆژئاوا بۆ ناوخۆی گەل و دەوڵەتەكانی خۆیان پشوویاندا و لەوكاتەوە وەک مرۆڤ بۆ خۆیان دەژین.

ئەورووپا پێش ئەوەی بگاتە بڕوای تەواو بە قسە و بیروڕای بیرمەند و ڕۆشنبیر و فەیلەسوفەكانیان سەبارەت بە هۆشیاری تاک و دەستەجەمعی لەسەر خودناسی و مرۆڤناسی و مرۆڤ سالاری قەناعەتی تەواویان بە دەسەڵاتی هێز و پاوەنخوازیی و

داگیرکاری هەبوو، بۆیە ڕێیان نەدەکەوت لە چارەسەر.

دووەم: ژیاننناسی و دونیاناسی و دنیابینی (فەلسەفەی پاش بوون)

مرۆڤەکان بەشێوەیەکی گشتی ئاستی هۆشیاری تاکەکەسی و دەستەجەمعییان و دونیابینییان سەبارەت بە ژیان و ژیاننناسیان دەبێت بە سێ بەشی سەرەکییەوە:

١ – بەشێک لە مرۆڤەکان بیروڕایان وایە کە ژیانی دونیا پڕ بایەخ و بەهادارە و پاش مردنیش قۆناغی دیکە ماوە و ناکرێت مرۆڤ لێرە کۆتایی هەتا هەتایی پێ بێت. ئەم بەشە زیاتر ئەوانەن باوەڕیان بە سەرەتای بوونەوەر و بوونی خوڵقێنەر و زیندووبوونەوە و دنیایەکی دیکەی جیاواز هەیە.

٢ – بەشێکی دیکەی مرۆڤ بیروباوەڕیان وایە کە دونیا و ژیانی دونیا فرسەتێکە بۆ کار و هەوڵ و چێژبردن و دەبێت مرۆڤ لەزەت وەربگرێ لە هەموو چرکەساتەکان و غەریزەکانی تێرکات و خۆی نەبەستێتەوە بە هیچ شتێکەوە کە ئازادی ڕەهای سنووردار بکات، هەروەها باوەڕیان وایە نابێت هیچ ڕێگرییەک دروست بکرێت لە بەردەم ئازادی ڕەهای تاکدا بەناوی ئایین یان میتافیزیقیا یان جیهانی غەیب و نادیار.

٣ – بەشێکی دیکەی مرۆڤەکان پووچگەرایی و عەبەسییەکانن، ئەمانە بیروباوەڕیان وایە کە هیچ مانایەک و هیچ مەبەست و ئامانجێکی پیرۆز یان چێژبەخش لەم دونیا و ژینەدا نییە و ئەم وجودە نە سەرەتای هەیە و نە کۆتایی دێت و نە ژیان و جیهانێکی دیکە چاوەڕوانی مرۆڤ دەکات.

## شرۆڤە و وردەکاری ئەو سێ بەشەی سەرەوە:

شرۆڤەی بەشی یەکەم یان تاقمی یەکەم لە مرۆڤەکان:

ئەم بەشەی مرۆڤ باوەڕدارن، باوەڕیان بەوە هەیە کە ئەم بوون و گەردوونە خاوەن و خوڵقێنەری هەیە، ئەو خوڵقێنەرە بێ هودە ئەم بوون و گەردوونەی نەخوڵقاندووە، بۆیە ئەم ئیماندار و باوەڕدارانە باوەڕیان بەم شێوەیەی خوارەوە دامەزراوە و لێرەوە ژیاننناسی و دونیاناسی و دونیابینییان دەستپێدەکات:

- (خوڵقێنەر، خودا، الله....) لە نەبوون و عەدەمەوە ئەم بوون و بوونەوەرەی دروستکردووە. (ألا له الخلق) (الأعراف: ٥٤).

- ئەم بوونەوەرەی بە سیستم و وردەکاریی و تەواوکاریی و گرێدراو بە (زەمان و مەکانەوە) گرێداوە و سەرپەرشتی دەکات و سەرەتا و کۆتایی هەیە. (ألا له الخلق والأمر) (الأعراف: ٥٤).

- لەم بوونەوەرەدا مرۆڤی جیاکردووەتەوە و بەتایبەت دروستیکردووە بۆ دوو مەبەست و بەرپرسیارێتی، یەکەمیان بۆ پەرستش و دووەمیان بۆ ئاوەدانکردنەوەی سەرزەویی و سوودوەرگرتن لە تەواوی دروستکراوەکانی دیکە بە ئاسمانییەکانیشەوە.

- هەموو کەرەسە و پێداویستییەکانی خوداناسی و ئاوەدانکردنەوەی سەرزەویی بە مرۆڤ بەخشیوە، وەک:

- ڕووحێکی تایبەت کە هەڵگری ڕێژەیەکی دیاریکراوە لە ناوە پیرۆزەکانی خودا. (ونفخت فيهمن روحي) (الحجر: ٢٩).

- جەستەیەکی گونجاو و کارا و تێر و تەسەل و بێ کەم و کورتی. (لقد خلقنا الإنسان في أحسن تقويم) (التين: ٤).

- عەقڵێکی تایبەت کە توانای گەشەکردنی بەردەوامی هەیە.

- لەگەڵ یەکەم مرۆڤدا پەیام و پەیامنێری ناردووە بۆ دوو مەبەست، یەکەمیان بۆئەوەی مرۆڤ بزانێت چۆن خوای تاک و تەنها و خوڵقێنەر دەپەرستێت، دووەم: بۆ گەیاندنی بەها باڵاکان و ئەخلاقە بنەڕەتییەکان و ئاماژەکانی بیرکردنەوە لە بوونەوەر و سوودوەرگرتن لە هەموو دروست کراوێک:

(وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ) (الذاريات: ٥٦)
(وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ) (الجاثية: ١٣)
(إِنَّ اللَّه يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ) (النحل: ٩٠)

- بۆ ئەوەی عەقڵ و دونیابینی مرۆڤ هاوسەنگ بێت و بەرچاوڕوون بێت مەبدەء و پرەنسیپێکی بۆ ناردووە و دەفەرموویت: (وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إن) (القصص: ٧٧).

- دونیا و ژیانی دونیا بە هەموو خۆشی جوانییەکانییەوە، بە هەموو ناخۆشیی و نەخۆشی و مەرگەساتەکانییەوە، بە تەمەنی گەنجی و پیرییەوە، پرۆسەیەکە کۆتایی دێت و لە ژیانی هیچ مرۆڤێکەوە دووبارە نابێتەوە و هەر هەمووی پێشەکی و ئامادەسازییە بۆ ژیانێکی شایستەی نەبڕاوە بە مرۆڤە ئیماندار و ساڵح و چاکەخواز و بونیادنەرەکان، ئەوانەی توانیان هەستن بە ئەرکی بەرپرسیارێتی ئاوەدانکردنەوەی سەر زەویی و دووربوون لە زوڵم و فەساد و تێکدانی ژیان و ژینگە.

(وَاتَّقُواْ يَوْماً تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ) (البقرة: ٢٨١).

(وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا) (الأعراف: ٥٦)
(وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ) (غافر: ٣٩).

ـ بەهەشت و ڕەزامەندی خوای خوڵقێنەر، بێ کار و کردەوەی چاک و خەبات و لێبڕان و ئەنجامدانی بەرپرسیارێتی دەستناکەوێت.

(مَنْ عَمِلَ صَالِحاً فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاء فَعَلَيْهَا) (فصلت: ٤٦)
(وَمَا أَنَا بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ) (ق: ٢٩).

ـ کردەوەی چاک (العمل الصالح) تەنها پەرستشەکان نییە، بەڵکو هەموو کردەوە و هەڵسوکەوت و کارێکی پەسەندی کۆمەڵایەتی بەرامبەر تاک و کۆمەڵگە و ژینگە و ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان، هەر هەمووی پاداشتی لەسەرە و بەشێکە لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی.

ـ ئەم بەشە لە مرۆڤ:

باوەڕ و دونیابینییان وایە کە ئازادیی و کەرامەتی مرۆڤ و پاراستنی نەژاد و نەتەوە و سەروەری گەلان هەر هەمووی ئایەتی خودایە وەک هەر ئایەتێک کە لە ئاسمانەوە دابەزیبێت، یان هەر ئایەتێکی بوونەوەر و سروشت.

ـ پێشکەوتن و نەوەستان و داهێنان بە ئەرکێکی گەورە و پیرۆز دەزانن و بەشێکە لە ئەرکی پەرستش و ئاوەدانکردنەوە و خەلافەت.

ـ هەموو جۆرەکانی زانست بە ئەرکێکی شەرعی و ئەخلاقی دەزانن، هەر خەمساردییەک بە گوناهـ و تاوان دەزانن.

ـ ئیدارەی وڵات و خەڵک و سامان بەشێوەیەکی زانستی و عادیلانە و بەپێی پێوەرە پێشکەوتووەکان بە ئەرکێکی شەرعی و ئەخلاقی دەزانن.

پۆلێنکردنی ئەم بەشەی مرۆڤەکان کە ئایندارە پەیامدارەکان و خەڵکە پابەندەکەیە بە شەریعەت و قورئانەوە:

١ – خەڵکە گشتیەکەی کە ئینتیمایەکی ئایینی، ئیمانی، ئەخلاقییانەی گشتییان وەرگرتووە هیچ نکۆڵی لەو خاڵ و پرەنسیپانەی سەرەوە ناکەن و لەسەر فیترەت ئیمان و ئیسلامیان وەرگرتووە بەشێوەیەکی گشتی پێوەی پابەندن و ڕادەی هۆشیارییان وابەستەیە بە واقیع و هۆشیاری نوخبەوە.

٢ – خەڵکە نوخبەکەی کە بریتییە لە:

١ – زانایانی ئاییناس و شەرعناس.

٢ – مەزهەبگەراکان.

٣ – سیاسییەکان و تەوژمە ئایینییە سیاسییەکان.

ئەم سێ بەشە و پەل و پۆکانیان، هەریەکەیان هەڵوێست و دید و دونیابینی و ژیانناسی تایبەتیان هەیە، هەندێک جار ناکۆکی نێوان خۆیان دەگاتە سنووربەزاندنی تەواو بەرانبەر بە خۆیان و دەرەوەی خۆشیان.

- جیاوازییەکانی نێوان نوخبەی زانا و سیاسییەکان و مەزهەبییەکان لە کاڵبوونەوەی زۆردایە بەراورد بە سەد ساڵ و پەنجا ساڵی ڕابردوو، ئەوەش هەندێکی واقیع دەیچەسپێنێت و هەندێکیشی هۆشیاری نوخبەکە خۆی.

- لە سەردەمی کرانەوە و تەکنۆلۆجیای سەردەم پەرەسەندنەکانی ئابووریی و هۆشیاری فیکریی و سیاسیدا، کاڵبوونەوەیەکی زۆر دەستیپێکردووە لەڕووی توندڕەویی و دەمارگیرییەوە لە ساڵانی داهاتوو ڕێژەی دوگماکردن و فریودان و خەڵەتاندن زیاتر کاڵ دەبێتەوە بەهۆی زیاتر بەرەوپێشچوون و فرەیی و سەرچاوەی زانیاریی و میکانیزمەکان و هۆکارەکانی زانست و مەعریفە و زانیارییەکان لە هەموو بوارەکانی ئایینی و فیکریی و فەلسەفی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی.

- لە داهاتوودا تەکنۆلۆجیای زیرەکی دەستکرد بەشێوەیەک پەرەدەستێنێت بە ئاسانی ناتوانرێت خەڵک بە هەڵەدا ببرێت و دۆگما بکرێت.

- دینداریی و ئیمانداری لە ئاییندەدا دەبێت ئەوەندە بە ئەخلاق و ڕەفتار و زانستەوە ببەسرێتەوە و ئەوەندە بەکاری ئامانجدار و چاکەوە ببەسرێتەوە کە بوار نەمێنێت بۆ خەڵکێک بەناوی ئایین و خوا و پیرۆزییەکانەوە دونیابینییەکی سەقەت بەرهەم بهێنن و خەڵکی لەسەر پەروەردە بکەن، مەبەستم ئەوەیە بڵێم لە ئایندەیەکی نزیکدا خەڵک گوێ لە قسەی بێ کردار ناگرێت و گوێ لە بانگەشەی دوور لە زانست و بێناوەڕۆک ناگرێت، بۆیە پێویستە لەسەر هەموو ئیماندار و مسوڵمانێک لەسەر هەموو تاقم و گرووپ و تەوژمێک لە ئێستاوە فریای خۆیان بکەون، چونکە پەرەسەندنەکانی زانست و تەکنەلۆجیا هەموو کەسێک دەخاتە ژێر پرسیار و چاودێریی و بوار ناهێڵێتەوە بۆ یاری کردن بە سۆز و لا شعووری خەڵک.

## چەند ئاماژەیەک لەسەر مەزهەب، بەرەو هۆشیارییەکی باشتر و کامڵتر:

+ مەزهەب چییە؟ زانایانی زانستە شەرعییەکان دەڵێن: مەزهەب بریتییە لە بۆچوون و تێگەیشتن و میتۆدی زاناکان لە بوارە جیاوازەکانی عەقیدە، فیقە، ئوسوڵی فیقە، زانستی فەرموودە، یان زمانی عەرەبی، یان زانستێکی دیکەی پەیوەست بە زانستی شەرعی و ئیسلامی.

+ بەر لە سەد ساڵ تێپەڕین بەسەر هاتنەخوارەوەی قورئان و قۆناغی مەككە و مەدینە و سەردەمی تەواوی خەلیفەكان وەفاتی تەواوی هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) و تەواوی فەتحی ئیسلامی بۆ عێراق و ئێران و ئەفریقا و خوراسان، یەكەم كەس و یەكەم مەزهەبی فیقهی كە لەدایك دەبێت پێشەوا ئەبووحەنیفەی نوعمانە، كە لە ساڵی ٨٠ی كۆچی لەدایك دەبێت و لە ساڵی ١٥٠ك وەفات دەكات.

+ هۆكاری سەرەكی و بنەڕەتی سەرهەڵدانی مەزهەبەكان دەگەڕێتەوە بۆئەوەی كە پاش فەتحی ئیسلامی و گەشتنی پەیام و دەسەڵاتی ئیسلامی بە نەتەوە و زمانە جیاوازەكان كە زۆربەیان عەجەم بوون و، هیچیان لەبارەی زمانی عەرەبی نەدەزانی، ئیدی پێویستی دەكرد بە زمانە جیاوازەكان و بە زمانی عەرەبیش دەقەكان لێك بدرێنەوە و زانستەكانی خزمەتكار بە شەریعەت بەرهەم بهێنرێن و وەڵامی پرسیارە نوێیەكان و چارەسەری ڕووداوە نوێیەكان وەڵامیان هەبێت.

+ مەزهەب و پەرەسەندنەكانی و هۆكارەكانی فرە مەزهەبی ڕیشە و هۆكارێكی مێژوویی قووڵ و دورو درێژی هەیە، سەرەتا بە سادەیی و دوور لە دەمارگری دەستپێدەكات و بڵاودەبێتەوە، پاشان پەیڕەوانی مەزهەبەكان بە هۆكاری سیاسیی و دەمارگیریی و پشتگیریی دەسەڵاتی سیاسی و كەمی هۆشیاری خەڵك و پەیڕەوانی مەزهەبەكان چەند قۆناغێكی هەستیار و خەتەرناك بەخۆیەوە دەبینێت و لە قەیرانی سەرمەزهەبەكانەوە بەرانبەر دەسەڵاتەكانی سەردەمی خۆیان دەستپێدەكات و بە چەندەها تەنگەژە و قەیرانی پەیڕەواندا تێدەپەڕێت و لە هەندێك قۆناغدا خوێنی بە ناهەق تێدا ڕژاوە و فەتوای لە دین دەرچوون و فاسق بوون و باتڵ بوونیان لەسەر یەكتر داوە، ئەم خراپ تێگەیشتن لە مەزهەب و خراپ بەكارهێنان و ناشیرینكردنە زیاتر لە یازدە سەدەی تێپەڕاندووە، لەلایەك بووەتە هۆكاری لاوازبوونی ئومەت و زانست و، لەلایەكی دیكەشەوە لە دەرئەنجامی ململانێی قوڵ بووەتە هۆی دەوڵەمەندكردنی توراسی فیقهی.

+ لە دوای سەدەی بیستەم و گۆڕانكارییە گەورەكانی دونیای سەردەم و سەرهەڵدانی زانستی نوێ و دەوڵەتی نوێ و پیشەسازیی و تەكنەلۆجیا و كرانەوە و زانیاری زۆری بەردەست، ئیدی قەیرانی دەمارگیری بۆ مەزهەبەكان كاڵ بوونەوە.

+ ئەوەی جێگای سەرنجە و هەڵەیەكی گەورەیە، ئەوەیە كە نوخبەیەكی نێو خوێندەوار لە ئیسلامی و عەلمانی لە ئەكادیمی و تەقلیدی، لەبری ئەوەی سوود لەو سامانە فقهییە گەورە دەوڵەمەندە وەربگرن بۆ وەڵامی پرسیارەكانی سەردەم و چارەسەركردنی قەیرانەكان و تەنگژەكانی سەردەم، دەچن كاتەكانیان بە فیڕۆ دەدەن و بوون بە سێ

بەشەوە، بەشێکیان تووشی دەمارگیری بوون مەزهەب و توراس تەقدیس دەکەن و تازە خەریکی جوانکارین بۆ تەقلید. بەشێکی تریان ڕەفزی تەواوی توراس دەکەن و بەبێ کەڵک لە قەڵەمی دەدەن، بەشی سێهەم کە تازە خەریکە زۆر دەبن و گەشە دەکەن، بە هۆشیارییەوە مامەڵە لەگەڵ توراس و مەزهەب دەکەن.

ئەم خەڵکە هۆشیارە لە نوخبە و پیاوان زیاتر لە سەدەی نۆزدە دەستیان پێکرد و هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ فیکر و فەلسەفە و گەڕان بەدوای هەستانەوەی ئومەت، هەروەها کاریگەریی پێشکەوتنەکانی ڕۆژئاوا لە زۆربەی بوارەکانی ژیاندا، بەتایبەت زانست و ئابووریی و پیشەسازیی و مافی مرۆڤ.

- ئەمڕۆ و لەم سەردەمەدا، زانایانی هیچ مەزهەب و فیقهی ناتوانن وەڵامی پرسیارەکانی سەردەم و پەرەسەندنەکانی ژیان بدەنەوە، ئەگەر پەنا نەبەن بۆ پێوەر و پرەنسیپەکانی (فیقهی مەقاسیدی شەرعی) و ئیجتیهادی نوێ لەچوارچێوەی فیقهێکدا کە پێی دەگوترێت فیقهی هاوچەرخ.

**مرۆڤەکان لە بنەڕەتی بوون و وجوود و خوڵقاندندا هیچ جیاوازییەکیان نییە، بەڵکو ئەوە ژینگە و سیستەمە جیاوازەکانە تاك و کۆمەڵگە پەروەردە و ئامادە دەکات بۆ ژیان و ڕۆڵ بینین و هەستان بە بەرپرسیارێتییەکان.**

فیقعی هاوچەرخ و ئیجتیهادە نوێیەکان مەحاڵە وەڵامی پرسیارەکانیان پێ بدرێتەوە ئەگەر فیقی هەموو مەزهەبەکان و عەقڵ و مەقاسیدی شەرعی پێکەوە گرێ نەدرێت، تاوەکوو زاناکان بتوانن ئیجتیهادێکی نوێ بکەن، کەواتە هیچ مەزهەبێکی سەربەخۆ لەم سەردەمەدا بە تەنها ئامادەبوونی نییە و ئەوانەش کە بانگەشەی مەزهەبگەرایی دەکەن تەنها لە کۆمەڵێک بابەتی تایبەت بە پەرستشەکاندا بۆی هەیە بتوانن پابەند بن، ئەویش لەسەر ئاستی تاکەکەسی، چونکە ئەمڕۆ خەڵکێکی زۆر و زۆربەی خەڵک نوێژیش بە تێکەڵەی مەزهەبەکان دەکەن و

بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن مەزهەبەکەی خۆیان وەلا ناوە، بۆ نموونە: ئیمام و مەئموم هەردووکیان شافیعی مەزهەبن و دیفاعی لێ دەکەن کەچی لە نوێژی بەیانیاندا حەنەفی مەزهەبن و قونووت ناخوێنن، لە دەستنوێژگرتندا حەنەفی و مالیکین و دەستیان بەر دەستی خێزانیان بکەوێت دەسنوێژ ناگرنەوە و لە سەفەردا کەمتر لە ٧٦ کیلۆمەتر سەفەر دەکەن و (قەسر و جەمع) دەکەن، ئەم نموونەیە دابەزێنە زۆر بابەتی دیکەش.

ئەم حاڵەتە تەواو تەندروستە و هیچ ناشەرعی و ناپاکی تێدا نییە، چونکە مەزهەب و فیقهەکان هەموویان یان ڕاستەوخۆ دەقەکەیان دابەزاندووە یاخود دەقەکانیان شیکردووەتەوە، یان ئیجتیهادی نوێیان کردووە، هەموویان لە بنەڕەتدا دەکرا یەک مەزهەب بن و زاناکانی ئەو مەزهەبە ڕا جیاوازەکانی مەزهەبەکانی دیکەیان دەربڕیایە، بۆیە ئەم پێگەیشتن و تێگەشتنە سەرەتایەکی باشی هۆشیارییە و لە ئاییندەدا زیاتر گەشە دەکات و پەرەدەسێنێت.

## ئەم بەشە لە مرۆڤەکان و سیاسەت و کار و تەوژمی سیاسی:

ئەگەر باسی ئەمڕۆ و ئەم سەردەمە بکەین بەتایبەت لە سەد ساڵی ڕابردوو تا ئەمڕۆ دەتوانین بە پوختی بڵێین: لەنێو ئوممەتی ئیسلامیدا بە عەرەب و عەجەمەوە زۆرینەی خەڵک ئیسلامێکی فیطریی و تەقلیدیان وەرگرتووە، کەمتر لا دەکەنەوە بە لای پرۆژە ئیسلامییەکانەوە وەک تەوژم و ئیتیجاهی سیاسی، ئەوەی کە زۆرتر و زیاتر پێوەی سەرقاڵە نوخبەیەکی خوێندەوار و کۆمەڵێک ئەهلی فیکر و زانایانی ئیسلامین. ئەو نوخبەیەش بە خۆیان و تەوژمەکانیانەوە دابەش بوون بە سەر کۆمەڵێک مەدرەسەی فیکریی و سیاسیدا و دەتوانین بەم شێوەی خوارەوە پۆلێنیان بکەین:

**- تەوژمی فیکریی و سەطحی و میانەڕەو کە دەبن بە چەند بەشێکەوە:**

١ - بەشێکیان تەنها سەرقاڵی بانگەواز و پێگەیاندنن و کەمتر ڕاستەوخۆ بەشداری کاری سیاسی دەکەن، وەک کۆمەڵەی نوور لە تورکیا و تەبلیغ لە پاکستان، لە کوردستانیش وەک ڕێخکراوە و کۆمەڵگەی مەدەنی سەریهەڵداوە و چەند ساڵێکە لەسەر ئاستی تاکی زانا و بانگخواز و ئاستی ڕێکخراوەکان لە گەشەدایە.

٢ - بەشێکی دیکەیان کاری سیاسی و ڕێکخراوەی و بانگەواز و پێگەیاندن دەکەن، هەموو ئامراز و میکانیزمەکانی کار و چالاکی بەکاردەهێنن و هەندێکجار وەک حیزبێکی سیاسی دەردەکەون و هەندێک جاریش ئەوەندە سەرقاڵی پەروەردە و بانگەواز دەبن کارە سیاسییەکە تەواو فەرامۆش دەکەن و دەبێتە چالاکییەکی وەرزیی و لەگەڵ نزیکبوونەوەی هەڵبژاردەکاندا گەرم دەبن و لەگەڵ کۆتایی هەڵبژدندا دۆسییەی حیزب و

سیاسەت دەپێچنەوە تا هەڵبژاردنێکی دیکە.

هۆکارەکانی ئەو حاڵەت و ناسەقامگیرییە چییە، کە نەبوونی ڕووئیەی ستراتیجی لێ دەخوێنرێتەوە:

١ – هۆکاری لاوازی فیکری، کەمی یان نەبوونی بیرمەند و مونەزیر و زانایانێک کە ئەوەندە پسپۆڕ بن ببنە (مەرجەع) و بتوانن ئیجتیهادی سیاسی بکەن و حیزب و دەعوەش لە سەرەوە بۆ خوارەوە قەناعەت پێ بکەن.

٢ – لە بنەڕەتدا کاری ئیسلامی بۆ ئەوە بونیاد نەنراوە لە کایە و مەیدانی ململانێی سیاسی و حیزبی و بە ئامرازەکانی دیموکراسی بگاتە دەسەڵات، بەڵکو حیزبی سیاسی ئیسلامی لە کوردستاندا بژاردەیەکی ناچارییە و چارەسەر و دەرچەیەکی دیکەی نەبووە جگە لە خۆڕێکخستن لە ڕێگای یاسای حیزب و ڕێکخراوەکانی هەرێمی کوردستانەوە.

بۆ سەلماندنی ئەم قسەیە، یەکەم جار کە یاسای حیزب و ڕێکخراوەکان لە ساڵی ١٩٩٢ لە پەرلەمانی کوردستان دەرچوو، برایانی موسڵمان (الإخوان المسلمين) لە شورای خۆیاندا پاش ڕاوێژ بە هەموو کادیر و بانگخوازەکان بڕیاریاندا بە خۆگونجاندن لەگەڵ ئەو یاسایە و ئامانجەکەش ئەوە بوو کە: چەترێک بێت بۆ ڕێکخستن و بانگەواز، لەهەمانکاتدا تووشی ئەوە نەبن کە ئیخوان لە میسر تووشی بوو.  ئەم ئامانجە بوویە ڕووئیەیەکی ستراتیژ و پاش چەند کۆنگرەیەک ناکاملێ ئامانج و بیرۆکەکە دەرکەوت و تا ئێستاش چارەسەر نەبووە، هەرچی بزووتنەوە و کۆمەڵی ئیسلامیشە کە لە بنەڕەتدا یەک شتن، ئەمان لە ساڵی ١٩٩٣ کە برایان بڕیاری دروستکردنی حزبیاندا بەپێی یاساکەی هەرێم، ئەو کاتە وەفدێکیان نارد بۆ سەرکردایەتی بزوتنەوە و ئاگاداریان کردنەوە کە ئێمە نیازێکی وامان هەیە و پێمانباشە ئێوەش سوود لەو یاسایە وەرگرن، بەڵام وەڵامی هەندێک لەوان کە ئێستا سەرکردایەتی کۆمەڵ دەکەن پێیانوابوو ئەو کارەی ئێمە ناشەرعییە و ئیسلام چۆن دەبێت مۆڵەت لە عەلمانی و یاسای عەلمانی وەرگرێت و ئەو شەرعیەتپێدانە بەو یاسایە کە فرە لایەنی سیاسیی و بەرەو دیموکراسییەتە پێچەوانەی پرەنسیپ و بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامە، بەڵام دواجار و دوای ئەزمونکردنی ئەو بیر و بۆچوون و قەناعەتانەی کە هەبوون، ئەوانیش بە ناچاریی و دوور لە قەناعەتی فیکری حزبیان دروستکرد و خۆیان ڕێکخست لەگەڵ یاساکانی هەرێمدا، تا ئێستاش لە ناخەوە قەناعەتیان دانەمەزراوە، لەبەرئەوەی لەسەر قەناعەتی فیکریی و زانستی چەکیان دانەناوە، بۆیە هەرچۆنێک یەکگرتوو لە ناوەوە دوو بەشی قووڵی شەرەکین لە نێوان ئەوانەی باوەڕیان بە کاری سیاسیی و حیزبی و ململانێی سیاسیی و بەشداری

سیاسیی و گەیشتن بە دەسەڵات هەیە و ئەوانەی باوەڕیان بە دەعوە و بانگەواز و ڕێکخستن هەیە و بە ناچاری کاری سیاسی دەکەن، ئەم دابەشبوونە حەقیقەتە و نەک لە کوردستان، بەڵکو لە هەرچی وڵات هەیە کە ئیخوانی تێدایە دابەشبوونەکە بەوشێوەیەیە و لە هەشتاکانەوە لە میسر سەریهەڵداوە لە مەغریب و تونس و جەزائیر ڕەنگیداوەتەوە، پاشان گەیشتە ئەردەن و لوبنان و دواجار گەیشتە هەرێمی کوردستان.

بە هەمان شێوە ئێستا لەنێو کۆمەڵی دادگەری ئیسلامیدا هەمان دابەشبوون هەیە لە نێوان ئەوانەی باوەڕیان بە کرانەوەی فیکریی و سیاسی هەیە و ئەوانەی هێشتا سەلەفی و سەلەفی جیهادین و بەناچاری کاری سیاسی دەکەن.

خوێندنەوەیەک بۆ دونیابینی و خودناسی و مرۆڤناسی لای ئەم تەوژمە لە بزاوتی ڕێکخراوی ئیسلامی:

ئەم تەوژمە لەڕووی پابەندی بە پەرستشەکانەوە کێشەیان نییە، بەڵام لەڕووی فیکریی سیاسیی و کاری سیاسییەوە هێشتا یەکلایی نەبوونەتەوە و تائێستاش بەرچاو ڕوون نین، هەندێک لەناو مێژوودا دەژین و هەندێکیان ئیسلام بەشێوەیەک وێنا و تەفسیر دەکەن مەحاڵە لەم سەردەمەدا دەوڵەت و دەسەڵاتی پێ بونیاد بنرێت، هەندێکیان گەیشتونەتە ئەو قەناعەتەی کە دەرگای سیاسەت و دەسەڵات بەڕوویاندا داخراوە، هەندێکیان دیموکراسیی و ئاڵوگۆڕی دەسەڵات وەک قۆناغ تێدەگەن، جگە لەوەش هاوڵاتی و مەدەنی بوون و دەوڵەتی مەدەنی بە ناشەرعی دەزانن.

لە هەموو ئەوانەی سەرەوە ڕوونتر ئەوەیە کە هێشتا مرۆڤ و سەنتەربوونی مرۆڤ لە ژیانی دونیا و حوکمڕانیدا لایان یەکلایی نەبووەتەوە، بەڕادەیەک ئێستا نەیانتوانیوە مەقاسیدی شەریعەت بەوشێوەیە تەفسیر بکەن و دایبەزێنن بۆ ئەندام و کادیر و خەڵکەکەیان کە مرۆڤ سەنتەری سەنتەری مەقاسیدی شەریعەیە، بەڵکوو لای ئەوان شەریعە خۆی سەنتەر و مرۆڤ ئامرازە و تا ئەو بابەتەش ساغ نەبێتەوە ناتوانن مرۆڤناسی و خودناسی بگەیەننە ئاستی چەمک و پرەنسیپەکانی قورئان و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی نوێ.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو تێبینییانەی سەرەوەدا تەوژمی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی چەند هەنگاوێکی بە کرداری بڕیوە، لەوانە:

١ – دەستی هەڵگرتووە لە شیعاری دەوڵەتی خەلافەی ئیسلامی.

٢ – دەستی هەڵگرتووە لە گۆڕانگاریی و گەیشتن بە دەسەڵات لە ڕێگای چەک و جیهادی هێزی چەکەوە.

٣ - وازیهێناوه له تهکفیری ئهحزاب و دهسهڵاتهکانی تهشریعیی و تهنفیزیی و قهزایی.

٤ – ڕازی بووه به بهشداری له پرۆسهی ههڵبژاردن و دیموکراسی و، ڕایگهیاندووه ئامادهن بۆ ئاڵوگۆڕی دهسهڵات به ئاشتی.

٥ - ڕازی بووه به فرهیی سیاسی و ئایینی و، بهشداری بۆنهکانیان دهکهن.

٦ - باسی (تطبيق الشريعة) ناکهن له سنووری نهگۆڕهکاندا نهبێت.

٧ - ڕازی بوون بهوهی کۆنگرهی ناوخۆی خۆیان بگرن و بهشێوهی دیموکراسی ئاڵوگۆڕی دهسهڵات و پێگهکانیان بکرێت لهنێو حزب جگه له پێگه و دهسهڵاتی سهرۆک یان ئهمیر یان ئهمیندار، واته کار به پێڕهوی (شوراسی) دهکهن شوورا + دیموکراسی، به میکانیزمی شوورا سهرۆک دهمێنێتهوه، چونکه له جێگای خهلیفهیه و به میکانیزمی دیموکراسیش کار دهکهن بۆ خواری حیزب، لهوحاڵهتهدا شوورا له بهرانبهر سهرۆکی حزب ئیستیشارییه و بڕیارهکانی (موعليم)ن و (مولزيم) نین، بهڵام بۆ خوار سهرۆک بڕیارهکانی شوورا و کۆنگره مولزیمن.

٨ – پابهند نین بهیهک مهزههبی فیقهییهوه.

٩ - پابهند نین بهیهک مهزههبی عهقیدهییهوه، ئهوهی بنهڕهته لایان یهکتاپهرستییه.

١٠ - بۆ وهڵامی پرسیارهکانی بازاڕ و سیاسهت و سهردهم پهنا دهبهن بۆ فیقی هاوچهرخ وکاری پێ دهکهن.

له کۆتاییدا دهتوانین بڵێین، تهوژمی ئیسلامی ههنگاوێکی بڕیوه له هۆشیاری ئایینی و سیاسی و کۆمهڵایهتیدا، بهڵام هێشتا زۆری ماوه، ههنگاوهکه وهک پهیام قهناعهت بکات به کۆمهڵگه، چونکه تهوژمی ئیسلامی تا ئێستا نهبووهته تهوژمی کۆمهڵگه و نهبووهته خاوهنی دۆسیه سهرهکییهکانی کۆمهڵگه، بۆیه هێشتا لهبهر کۆمهڵێک هۆکار و فاکتهر کۆمهڵگه له ڕێژهیهکی دیاریکراودا که ناگاته ٢٥٪ تهزکیهی تهوژمی ئیسلامی و پرۆژهکانیان و ڕهمز و سهرکردهکانیان نهکردووه، بهڵام بۆ ئاینده له ههناوی تهوژمی ئیسلامیدا ڕۆح و عهقڵێک ههیه ئهگاته ئهو ئاستهش و ڕۆژێکه دێت دهکرێت ببنه ئهڵتهرناتیڤی ئهو دۆخهی که ئێستا ههیه، چونکه تهوژمهکانی دیکهی عهلمانی و نهتهوهیی و سیکۆلارهکان دۆخی فیکریی و ئایدۆلۆجی و مهدهنیی و حکومڕانی و دیموکراسییان له تهوژمی ئیسلامی باشتر نییه و خهڵک و کۆمهڵگهش سهرهتا تهزکیهی کردن و چهند جار تاقیکردنهوه، بهڵام له تاقیکردنهوهی خهڵک و کۆمهڵگه دهرنهچوون، بۆیه ئێستا بۆشایی متمانه ههیه له نێوان خهڵک و دهسهڵات و تهوژمه جیاوازهکاندا.

پ.د.عوسمان عەلی


# فۆبیای لۆزان

**فۆبیای لۆزان، کێ دروستی دەکات و بۆچی؟**

**ئایا حزبە کوردییەکان مافی خۆیانە، دژایەتی لۆزان بکەن؟**

سەرەتا دەبێ دان بەوەدا بنێین کە پەیمانی لۆزان تەنیا وابەستەی کوردستان نەبووە، بەڵکو کورد گەورەترین قوربانی بووە. دابەشکردنی خاکی کوردستان بوو لە نێوان بەریتانیا و هاوپەیمانەکانی لەلایەک و حکومەتی کەمالیستی تورکیای ئەوکات لەلایەن کۆمەڵەی گەلانیشەوە بەرەکەتی پێبەخشرا. سەبارەت بە کوردیش، ڕێککەوتنەکە لەسەر هیچ بنەمایەکی ئەخلاقیی و یاسایی و سیاسی دروست نەبووە، چونکە نوێنەری خەڵکی کوردستان لەکاتی دابەشکردنی زەوییەکانیان ئامادەنەبوون، ئەوەش پێشێلکردنی ڕێککەوتننامەی سیڤەر بوو، کە دانی بە مافی کورددا ناوە بۆ دروستکردنی قەوارەیەک،س هەروەها پێشێلکردنی پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسینی گەلان بوو کە لە میساقی کۆمەڵەی گەلاندا ئاماژەی پێکراوە و ئەو بەڵێنانەی پەیوەندیدارە بە سەرۆک کۆماری ئەمریکا و سەرۆکانی هاوپەیمانی خۆرئاوا کە لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بە گەلانی ژێرقەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانییان دابوو. جێی خۆیەتی  کە بڵێین، دەوڵەتی ئینگلیز بە پلەی یەکەم بەرپرسە لەم نادادپەروەرییە مێژووییە کە بەسەر کورددا هات.

پەیمانی لۆزان ئەمڕۆ شەرعیەتی نێودەوڵەتی هەیە لەسەر بنەمای بنەماکانی fait accompli کە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا پەسەند دەکرێن، سیستەمی ئاسایشی ناوچەیی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دامەزراند و وڵاتانی بەڵکانی دابەشکرد و هیچ ئاماژەیەک لە ئاسۆدا نییە بۆ گۆڕینی لە ئایندەیەکی نزیکدا. داعش دەیویست ئەم واقیعە بگۆڕێت، بەڵام زلهێزە نێودەوڵەتی و ناوچەییەکان هەوڵەکانی بۆ کۆتاییهێنان بە ڕژێمی ئەمنی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە هەڕەشە بۆ سەر ئاسایش و ئاشتی نێودەوڵەتی و ناوچەیی زانی و لەناویان برد.

لە تورکیا هەندێک بازنە هەن کە دەیانەوێت برگەکانی لۆزان لە دەریای ئیجەدا بگۆڕن، بەڵام لەگەڵ ڕەتکردنەوەی کۆدەنگی نێودەوڵەتی بەریەکدەکەون. کاتێک مەسعوود بارزانی بەهەمان شێوە هەوڵیدا، لەڕێگەی ڕیفراندۆمی سەربەخۆیی ساڵی ٢٠١٧، ئەم واقیعە بگۆڕێت، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بە دەرکردنی بڕیارێکی کۆدەنگی ئەندامانی خۆی بۆ ڕەتکردنەوەی ڕیفراندۆم ڕووبەڕووی بووەوە، وڵاتانی ناوچەکەش بەهەمان شێوە ڕیزی بڕیارەکەیان گرت لە دژی ڕیفراندۆمەکە.

کۆڕبەندە حزبیی و ئەکادیمیی و ڕۆشنبیرییەکان لە کوردستانی عێراق، خۆرئاوا و ڕەوەندی کوردی شاهیدی بەستنی چەندین کۆنفرانسن لە لۆزان و ئەم بابەتەش کە من پێی دەڵێم «فۆبیای لۆزان»، بووەتە سەرقاڵی ڕۆژنامەگەریی و کەشوهەوای ڕۆشنبیری کوردی، بەبێ ئەوەی زۆرێکیان سروشت و ڕاستی لۆزان بزانن. کێ ئەم کەشوهەوایە لە

کۆمەڵگەی کوردیدا دروست دەکات و بۆچی ئێستا؟

من وای دەبینم پارتە کوردییەکان و کەسایەتییە سیاسیی و ئەکادیمییەکانیان بەرژەوەندییان لە وروژاندنی پرسی لۆزان هەیە، بەڵام مافی ئەوەیان نییە. زۆربەی ئەو لایەنانە ئەو فایت ئەکۆمپلییان قبوڵ کرد کە ڕێککەوتنی لۆزان دروستی کردبوو و دەستبەرداری سەربەخۆیی کوردستانیان کرد و لە ڕێگەی ئەدەبیات و ڕێککەوتنەکانیان لەگەڵ حکومەتەکانی تورکیا و عێراق و سوریا دانیان بە سنوورە نێودەوڵەتییە هەبووەکاندا نا. لە تورکیا پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە) وازی لە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان هێنا و دان بەوەدا دەنێت کە باکوور بەشێکە لە خاکی تورکیا. هەروەها یە کێتیی دیموکرات (پەیەدە) لە سوریا ئامادە نەبوو قەوارەکە بە ڕۆژئاوا ناوی بهێنێت و ناوێکی دیکەی بەناوچەکەدا کە لە خۆرئاوای کوردستانی کۆنترۆڵی کردووە و ئەوەش دژی بیرۆکەی دەوڵەتی نەتەوەیی کوردە . سەرکردایەتی کوردیش لە هەرێمی کوردستان (پارتی و یەکیتی)، بە قبوڵکردنی دەستووری عێراقی ساڵی ٢٠٠٦، دانی بەوەدا نا کە باشووری کوردستان لەڕووی یاساییەوە بەشێکە لە قەوارەی عێراق.

لەڕاستیدا هاوپەیمانان کوردستانی گەورەیان دابەشکرد و لکاندیان بە چوار وڵاتی هەرێمایەتییەوە، بەڵام بەتەنها لایەنە کوردییەکان لە باشووری کوردستان، ئەم پارچەیان بەسەر سێ قەوارەی میلیشیادا دابەشکرد (ناوچەی زەرد و سەوز و سوور لە قەندەبیل و ٤٠٠ گوندی کوردی) کە لە ڕووی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەوە شکستیان هێنا و لەڕێگەی ئەم تاقیکردنەوە شکستخواردووانە لە باشووری کوردستان و ڕۆژئاوای کوردستان، کە کیانێکی هاوشێوەی پۆلیسی هەیە و لەلایەن گرووپێکی ستالینیستییەوە حوکمڕانی دەکرێ، خەونی کوردیان لەناوبرد بۆ بنیاتنانی کیانێک کە کەرامەتی خۆیان بپارێزێت و وەک گەلانی دراوسێ بژین.

کەواتە، حزبە کوردییەکان لە قەیرانی سیاسیی و ئابووریی کوشندەدا دەژین و پێدەچێت پێویستیان بە وروژاندنی هەستی کورد هەبێ بەرامبەر بە ڕێککەوتنێک کە شەرعییەتی فەیت ئەکۆمپلی بەدەستهێنابێت.

سەرکردەکانی کورد لەبری ئەوەی پەنا بۆ ئەو مانۆڕە سیاسییانە ببەن بۆ سەرقاڵکردنی خەڵک لە کێشە سەرەکییەکانی خۆیانن، پێویستە لەگەڵ جەماوەری کورد ئاشت ببنەوە و پێداویستییە سەرەتاییەکانیان دابین بکەن و کەرامەتی خۆیان بپارێزن. ئەگەر ئەو لایەنانە دانیان بە ڕێککەوتنی لۆزاندا نەنابا، ئەوا ئەوان دەیانگووت و بەرەی هێزەکانی کوردستان بۆ ڕزگاری کوردستان پێکدەهێنن و دان بەو سنوورانەی کە هەن نانێن. بەڵام ئەمە

دەرفەتێک بوو کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا لەدەستچوو، کاتێک هێزی کوردی نەیتوانی دروشمی سەربەخۆیی کوردستان بەرز بکاتەوە و داوای حوکمی زاتی کرد.

لەکۆتاییدا نالێین ڕێککەوتنێکی مێژوویی وەک ڕێکەوتننامەی لۆزان نابێت بخرێتەڕوو بۆ لێکۆڵینەوە لەلایەن ئەکادیمییەکانی کوردەوە، چونکە ئەمە بابەتێکی زۆر گرنگە، وانە بۆ بزووتنەوەی کوردی ئەمڕۆ لەخۆدەگرێت. سەرنج بدەن سەرکردە کوردەکانی ئەو سەردەمە لەت و ملکەچی باڵیۆزخانەی ئینگلیز و یۆنان بوون و بەشێکیان بە بەڵێنەکانی مستەفا کەمال فریو دراون و چوونە لۆزان بۆئەوەی بڵێن ئێمە دەمانەوێت لەگەڵ کۆماری تورکیا بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال بژین. بۆ ئەوان باشتر بوو خۆیان ئاشت بکەنەوە و بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی سەربەخۆ دابمەزرێنن. بیر لەوە بکەنەوە کە ئەمڕۆ چی دەگوزەرێت، بەوپێیەی هەرێمی کوردستان بە مەترسیدارترین و ناسکترین قۆناغەکانیدا تێدەپەڕێت، و ئەوەی کە سەرکردایەتی کورد سەرقاڵی هاوپەیمانی لەگەڵ دوژمنانی کورددایە، هەمووان دۆڕاو دەبن و نەوەکانی داهاتووش لەم هەڵسوکەوتە نابەرپرسیارانە لێیان خۆشنابن.

**تاریق یارەحمەدی**

**مامۆستای زمانی عەرەبی و توێژەری بواری دەستنووس لە تاران**

# هەوڵێک بۆ ناساندنی
# مەلامووسا کڵاشی

**پێشەکی:**

بنەماڵەی سدیقی کڵاشی یەکێکن لە بنەماڵە زانستییەکانی ناوچەی جوانڕۆ کە بە درێژایی مێژوو زانا و بیرمەندی گەورەیان لێ هەڵکەوتووە و چرای زانست و مەعریفە لەم بنەماڵەدا دوای چەند سەدە نەکوژاوەتەوە. هۆکاری ناوبانگی ئەم بنەماڵەیە بە سدیقی ئەوەیە کە نەسەبیان دەگەڕێتەوە بۆ حەزرەتی ئەبوبەکری سدیق. ئەم بنەماڵەیە بە مەلاییش ناسراون، چونکە پشتاوپشت هەموویان زانای ئایینی بوون. لە دیارترین زانا ئاینییەکانیان بریتیتن لە: مەلا ئەحمەد کڵاشی، مەلا عیسا و مەلا ئەحمەدی مەلاباشیی کڵاشی لە کتێب و تەزکیرەکاندا هاتووە، بەڵام ژمارەی زانایانی دیاری ئەم بنەماڵەیە زۆر زیاترە لەمانەیە. یەکێک لە زانایانی گەورەی ئەم بنەماڵەیە کە لە سەدەی ١٣ ژیاوە و تا ئێستا لە هیچ کتێبێکدا ناوی نەهاتووە، مەلا مووسای کڵاشییە. ئەم زاتە کوڕی مەلا عەبدوڵڵای گەورە و برای زانای بەناوبانگ مەلا عیسایە.

بۆ یەکەمجار دوو ساڵ لەمەوبەر لەکاتی گەڕان بەناو فەهرستی دەستنووسەکانی کتێبخانەکانی ئێراندا، کەسێکم بە ناوی (مووسا ئیبنی عەبدوڵلای کلاشی) بەرچاو کەوت. ئەم ناوەم لە کۆتایی دەستنووسی "رحمه الأمه فی إختلاف الأئمه" دۆزییەوە. دوای بەدەستهێنانی پەڕگەی دەستنووسی ئاماژەپێکراو و خوێندنەوەی، دڵنیابوومەوە کە ئەم مەلا مووسا کوڕی مەلا عەبدوڵلای گەورەی کلاشییە. ئەم بابەتە بووبە سەرەداوێکی زۆر باش بۆ من کە بەدوای دەستنووسی زیاتری مووسای ئیبنی عەبدوڵلای کلاشی بگەڕێم. دوای گەڕانێکی زۆر، خۆشبەختانە توانیم دەستنووسەکانی تری مەلا مووسا لە کتێبخانەی ناوەندی ئینسایکلۆپیدیای گەورەی ئیسلامی لە تاران بدۆزمەوە. هەروەها بە بەڵگەی بەردەست توانیم هەندێک دەستنووس بدۆزمەوە کە مەلا مووسا نووسیویەتی، کە بە هەڵە لە پێڕستی دەستنووسەکانی ئەم کتێبخانەیەدا بەناوی مووسای کاشانی تۆمار کرابوون. دواتر ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەر ئەو دەستنووسانە دەدەم.

بنەچە و ڕەچەڵەکی مەلا مووسا: سەبارەت بە ڕەچەڵەکی مەلا مووسا، لە کۆتایی دەستنووسی ژمارە ٧٥٥ دا بەم شێوەیە خۆی ناساندووە: قد وافق الفراغ من تعلیق هژه النسخه الشریفة المبارکة فی ضحوة یوم السبت احدی وعشرین من سید الشهور المسمی برمضان المبارک من شهور سنه ستین و مأتین بعد الألف من الهجرة النبویة المصطفویة علی صاحبة أفضل الصلاة وأتم السلام وأزکی التحیة علی ید الحقیر الفقیر العاصی المحتاج إلی مغفره ربی ربه الغفیر، موسی ابن عبدالله ابن محمد صالح ابن مصطفی الکلاشی بالوطن، و الأبوبکری بالنسبه من حوال قریة مسماه ب زلان من محال جوانرود.

کەواتە، لەسەر ئەم بنەمایە، دەکرێ مەلا مووسا وەک کوڕی مەلا عەبدوڵلا کەلاشی و برای زانا و شاعیری گەورە مەلا عیسا دەستنیشان بکرێت، کە لەم دەستنووسەدا بەڕوونی خۆی بە بنەماڵەی سدیقی، سەر بە عەشیرەتی کلاشی و دانیشتووی گوندی زلان لە نزیک جوانڕۆ ناساندووە. بە پشتبەستن بەم دەستنووسە، دەتوانرێت بەم شێوەیە مەلا مووسا بناسێنرێت"مەلا مووسا کوڕی مەلا عەبدوڵلا کوڕی مەلا محەمەد ساڵح کوڕی مەلا مستەفا لە زانایانی بنەماڵەی سدیقی کلاشییە".

### ساڵی لە دایکبوون و کۆچی دوایی مەلا مووسا:

سەرەڕای هەوڵ و گەڕان و پرسیارێکی زۆر لە نەوەکانی بنەماڵەی سدیقی کە لە جوانڕۆ و دەوروبەری دەژین، هەروەها پرسیارکردن لە هەموو ئەو کەسانەی کە پێدەچوو زانیارییان لەسەر بنەماڵەی سدیقی هەبووبێت، بەداخەوە هیچ زانیارییەک سەبارەت بە سەردەمی ژیانی مەلا مووسا تا ئێستا بەردەست نەبووە، بەڵام بە گەڕانی ورد لەناو ئەو

دەستنووسانەی کە بەدەستم هێناون خۆشبەختانە توانیم سەردەمی ژیانی بەم شێوەیە خوارەوە دیاری بکەم. کۆنترین دەستنووس کە بە خەتی مەلا مووسا نووسراوە، کۆمەڵە دەستنووسێکە کە دوو دەستنووس لەخۆدەگرێ و لە ساڵی ١٢٠٨ ک. م. بە خەتی ئەو نووسراوە و ئێستا بە ژمارەی١٤٩١ لە کتێبخانەی ناوەندی دائیرەتولمەعارفی گەورەی ئیسلامی لە تاران هەڵگیراوە. جگە لەم دەستنووسە، لە هەمان ساڵدا دوو دەستنووسی تریشی نووسیوەتەوە و ئەم دوو دەستنووسەش لە هەمان کتێبخانەدان بە ژمارەکانی ١٤٤٨/١ و ١٤٤٨/٣.

مێژووی دوا دەستنووس کە لەلایەن ئەوەوە نووسیویەتی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٢٦٠ی کۆچی. ئەم دەستنووسە لە کتێبخانەی ناوەندی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی ئیسلامی لە شاری قوم بە ژمارە ٧٥٥ هەڵگیراوە. لەلایەکی دیکەوە مەلا مووسا لە کۆتایی دەستنووسێک کە لەلایەن مەلا عیسای برایەوە نووسراوە، بابەتێکی نووسیوە، کە تێیدا مێژووی کۆچی دوایی مەلا عیسای برای خۆی تۆمار کردووە کە دەکاتە ١١ی مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٢٦٧ی کۆچی. ئەم دەستنووسە ئێستا بە ژمارە ١٦٧٨ لە کتێبخانەی عەللامە تەباتەبایی لە شیراز پارێزراوە. کەواتە بە پشتبەستن بەم بەڵگانە، دەکرێت کۆتاییەکانی سەدەی دوانزەی کۆچی وەک مێژووی لەدایکبوونی مەلا مووسا بخەملێندرێت و تا ساڵی ١٢٦٧ لە ژیاندا بووە.

خوێندنی مەلا مووسا:

لە لاپەڕە ١١٢ی دەستنووسی ژمارە ١٤٩١/١ نووسراوە: بلغ قراءة هذا الكتاب الى آخره مع كتابة الحاشية وتصحيحها عند أبى مولانا عبدالله كلاشى حفظه الله تعالى وايانا عن جميع بلاء الدنيا والأخرى آمين.

کەواتە دەکرێ بڵێین، مەلا مووسا زانستە ئاینییەکانی لە باوکییەوە فێربووە. بەڵام لە کۆتایی کۆنترین دەستنووسەکانیدا کە ٥٩ ساڵ لەگەڵ دوایین دەستنووسەکەیدا مەودای هەیە و ڕەنگە پەیوەندی بە سەردەمی فەقێیەتی مەلا مووساوە هەبێت، باسی چەند شوێنێکی کردووە کە لە کاتی نووسینی دەستنووسەکاندا لەوێ بووە. بەڵام ئایا لەم شوێنانە خوێندوویەتی یان قوتابخانە لەوێ بووە یان نا، تا ئێستاش بۆ من ڕوون نەبووەتەوە. بۆ نموونە لە کۆتایی دەستنووسی ژمارە ١٤٤٨/٣ ئەمەی نووسیوە: كتبه موسى ابن ملا عبدالله ابن مرحوم ملا محمد صالح ابن مرحوم المغفور مولانا مصطفى الكلاشى الأبوبكرى النسب والشافعى المذهب فى أذان الظهر فى باديه المشهورة ب سرپان فى سنة ١٢٠٨.

کەواتە لە کاتی نووسخە هەڵگرتن لە سەرپان بووە. سەرپان ناوی دەشتێکە لە

نزیک شێخ سێڵەی سەر بە شاری سەلاسی باوەجانی ئێستا. هەروەها لە کۆتا لاپەڕەی دەستنووسی ژمارە ١٤٩١/٣ باس لەوە دەکات کە لە دەشتی حوڕ بووە. ئەوەی کە لەم دەستنووسەدا نووسیویەتی ئەمەیە: تمت النسخة المباركة ... على يد المحتاج الى عفو الملك الصمد موسى ابن ملا عبدالله ابن مرحوم مولانا محمد صالح ابن مرحوم مغفور جنت مكان ملا مصطفى ابن مرحوم ملا حسين ابن مرحوم ملا موسى الكلاشى الأبوبكرى نسبا والشافعى مذهبا والقصيرى طريقة  فى يوم الأربعاء من شهر صفر المظفر فى باديه دشت حر (سرحد روم و قزلباش) من سنه ألف و مائتين و ثمانية من الهجرة النبوية المصطفوية.

لە کۆتا دەستنووسی ژمارە ٧٥٥ کە بە خەتی مەلا مووسا نووسراوە و ئێستاش بەردەستە وەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد، خۆی وەک دانیشتووی گوندی زلانی جوانڕۆ ناساندووە.

لە هەموو سەیرتر ئەوەیە کە لە کۆتایی دەستنووسی ژمارە ١٤٩١/١ نووسیویەتی: "حرره موسى ابن ملا عبدالله الكلاشى الابوبكرى فى البادية المشهورة ب زرده پل من محال دالهو" بەپێی ئەم بەڵگەیە لە کاتی نووسینی ئەو دەستنووسە لە گوندی زەردەی داڵەهۆ بووە. دانیشتوانی ئەم گوندە ئێستا لەژێر ئایینی یارساندان.

لەمە زیاتر هیچ زانیارییەک لەسەر ژیانی مەلا مووسا بەدەست نەهاتووە، تەنها ئەوە نەبێت کە لە قەباڵەیەکی بەشکردنی میراتدا کەسێک بەناوی عەبدولقادر وەک کوڕی مەلا مووسا ناوی هاتووە. ئەم قەباڵەیە لە ئێستادا لەلای کاک موئمینی وەیسی لە جوانڕۆ پارێزراوە. سەرەڕای هەوڵێکی زۆر، بەداخەوە تا ئێستا نەمتوانیوە نەوەکانی بدۆزمەوە.

**بەرهەمەکانی مەلا مووسا:**

جگە لە مەنزوومەیەکی شیعری کورت کە دواتر باسی دەکەین، مەلا مووسا بەرهەمێکی دانراوی خۆی نیە، بەڵام دوای گەڕانێکی زۆر، خۆشبەختانە توانیم سێ کۆمەڵە دەستنووس و دوو تاکە دەستنووس لە کتێبخانەکانی تاران و قوم بدۆزمەوە کە هەمووی بە خەتی مەلا مووسا نووسراون. بەشێک لەو دەستنووسانە بەهۆی شارەزا نەبوونی پێڕست نووسەکان، ناوەکان بە هەڵە تۆمار کرابوو، ئەمەش وایکردووە کە لە چاوی لێکۆڵەرانی کورد دوور بمێنێن. بۆ نموونە دەستنووسی ژمارە ١٤٤٨/١ و ١٤٤٨/٣ لە باتی کلاشی، بە کاشانی تۆمار کراوە، و بە هەڵە زانایەکی کورد دراوەتە پاڵ کاشان کە شارێکە لە ناوەڕاستی ئێران. ئەمە لەکاتێکدایە کە مەلا مووسا هەم لە کۆتایی هەر کام لەو دەستنووسانە، هەم لە ناوەڕۆکیاندا بەڕوونی ناوی تەواوی خۆی نووسیوە. ئەگەر بە تاک بژمێرین، کۆی گشتی دەکاتە ١٣ دەستنووس.

**وردەکاری هەریەکێک لەم دەستنووسانە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:**

- کۆمەڵە دەستنووسی ژمارە ١٤٤٨، ئەم کۆمەڵە دەستنووسە لە کتێبخانەی دائیرەتولمەعارفی گەورەی ئیسلامی تاران هەڵگیراوە. ساڵی ١٢٠٨ و ١٢٠٩ کۆچی نووسراوە، و بەگشتی ٨ دەستنووسە، کە پێنجیان بە خەتی مەلا مووسایە. بابەتی هەموویان زانستی بەلاغەیە. لەو ٥ دەستنووسە چواریان عەرەبییە و مەلا مووساش تەنیا وەک ناسیخ یان کاتب ڕۆڵ دەبینێ، ئەوەی تریان شیعرێکی فێرکارییە بە زمانی فارسی، بابەتەکەیشی زانستی ئیستیعارەیە کە مەلا مووسا خۆی هۆنیویەتییەوە و بە خەتی خۆیشی نووسیویەتی – زانیاری زۆرتر لەسەر ئەم شیعرە دواتر باس دەکەین، زانیاری زیاتر لەسەر ئەم ٥ دەستنووسە لە خشتەی ژمارە (١)دا هاتووە:

| ناوی دەستنووس | دانەر | ژمارەی لاپەڕە | ژمارەی دەستنووس |
|---|---|---|---|
| شەرحی رسالة الوضعیة العضدیة | لەیسی سەمەرقەندی | ٢٦ لاپەڕە | ١٤٤٨/١ |
| پەراوێزیک بۆ شەرحی الرسالة الوضعیة | ئەبولوەقا | ٢٤ لاپەڕە | ١٤٤٨/٣ |
| شەرحی رسالة الإستعارە | عوسامەدینی ئەسفراینی | ٧٤ لاپەڕە | ١٤٤٨/٦ |
| منظومە استعارە | مووسا بن عەبدوڵڵای کلاشی | ١ لاپەڕە | ١٤٤٨/٧ |
| پەراوێزی شەرحی رسالة الإستعارة | حەسەن بن محەمەدی زێباری | ١٦ لاپەڕە | ١٤٤٨/٨ |

**خشتەی ژمارە (١) کۆمەڵە دەستنووسی ژمارە ١٤٤٨ بە خەتی مەلا مووسا، پارێزراو لە کتێبخانەی دائیرەتولمەعارفی گەورەی ئیسلامی تاران**

- کۆمەڵە دەستنووسی ژمارە ١٤٧٤، ئەم کۆمەڵە دەستنووسەش لە کتێبخانەی دائیرەتولمەعارفی گەورەی ئیسلامی تاران هەڵکەوتووە و سێ دەستنووس بە زمانی عەرەبی لەخۆدەگرێت. بابەتی هەر سێ دەستنووسەکە بریتییە لە زانستی کەلام و بیروباوەڕ. مەلا مووسا ئەم دەستنووسانەی لە ساڵانی ١٢١١ و ١٢١٢ی کۆچی نووسیوە. زانیارییەکانی ئەم کۆمەڵە دەستنووسە لە خشتەی ژمارە ٢ی خوارەوەدا هاتووە.

| ناوی دەستنووس | دانەر | ژمارەی لاپەڕە | ژمارەی دەستنوس |
|---|---|---|---|
| پەراوێزی شەرح العقائد النسفیە | ئەحمەد بن مووسای خەیاڵی | ٣٣٠ لاپەڕە | ١٤٧٤/١ |
| حاشیة حاشیة الخیالي علی شرح عقائد النسفي | یوسف بن مەحموود گۆرانی | ٣١٢ لاپەڕە | ١٤٧٤/٢ |
| زبدة الأفكار | عەبدولحەکیم سیالکۆتی | ٢ لاپەڕە | ١٤٧٤/٣ |

**خشتەی ژمارە (٢) کۆمەڵە دەستنووسی ژمارە ١٤٧٤ بە خەتی مەلا مووسا، پارێزراو لە کتێبخانەی دائیرەتولمەعارفی گەورەی ئیسلامی تاران**

- کۆمەڵە دەستنووسی ژمارە ١٤٩١، ئەم کۆمەڵە دەستنووسەش هاوشێوەی ئەو دوو کۆمەڵە دەستنووسەی کە پێشتر باسمان کرد، لە کتێبخانەی دائیرەتولمەعارفی گەورەی ئیسلامی لە تاران هەڵگیراوە و ٣ دەستنووس لەخۆدەگرێت. دوو لە دەستنووسانە عەرەبی و یەکێکیان فارسییە و بابەتی هەموویان زانستی لۆژیکە. لە ساڵی ١٢٠٨دا نووسراوە. وردەکاری زیاتر لە خشتەی ژمارە (٣)دا هاتووە.

| ناوی دەستنووس | دانەر | ژمارەی لاپەڕە | ژمارەی دەستنووس |
|---|---|---|---|
| شەرحی ئیساغوجی | محەمەد بن هەمزە فەناری | ١٠٢ لاپەڕە | ١٤٩١/١ |
| آداب البحث و المناظرة (شیعر) | دەشتەکی شیرازی | ١ لاپەڕە | ١٤٩١/٢ |
| حاشیة الفواید الفناریة | ئەحمەد بن محەمەد قول ئەحمەد | ١١٤ لاپەڕە | ١٤٩١/٣ |

**خشتەی ژمارە (٣)، کۆمەڵە دەستنووسی ژمارە ١٤٩١ بە خەتی مەلا مووسا، پارێزراو لە کتێبخانەی دائیرەتولمەعارفی گەورەی ئیسلامی تاران**

**. دەستنووسی زبدة الأفكار:**

ئەم دەستنووسە بە ژمارەی ١١٩٧ لە کتێبخانەی دائیرەتولمەعارفی گەورەی ئیسلامی لە تاران پارێزراوە. ئەم دەستنووسە بە زمانی عەرەبییە و بابەتەکەی بریتییە لە زانستی کەلام و بیروباوەڕەکان، دانەری ئەم بەرهەمە عەبدولحەکیمی سیالکۆتییە. مەلا مووسا لە مانگی شەوالی ساڵی ١٢١٠ 1210ی کۆچی نووسخەی لێ هەڵگرتووە.

ـ دەستنووسی رحمة الأمه فی إختلاف الأئمه:

دانەری ئەم کتێبە محەمەد بن عەبدولڕەحمانی قازی سەفەدییە. زمانی ئەم کتێبە عەرەبییە و بابەتەکەی زانستی فیقهییە. بەپێچەوانەی دەستنووسەکانی تر، مەلا مووسا لە تەمەنی پیریدا ئەم دەستنووسەی نووسیوە. ئەم بەرهەمە لە ٢١ی ڕەمەزانی ١٢٦٠ی کۆچی نووسراوە و لە کتێبخانەی ناوەندی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی ئیسلامی (کتابخانه مرکز مطالعات و تحقیقات اسلامی) لە شاری قوم بە ژمارە ٧٥٥ هەڵگیراوە.

ڕاستکردنەوەی هەڵەیەک:

یەکێک لەو کێشانەی کە پەیوەندی بە بواری دەستنووسەوە هەیە، نوسینی پێڕستی دەستنووسەکانە لەلایەن کەسانێکەوە کە سەرەڕای شارەزایی لە بواری پێڕست نووسیندا، بەڵام لەبەرئەوەی شارەزاییەکیان لەسەر زانایان و نووسەران و جوگرافیای نووسینی هەندێک دەستنووس نیە، هەربۆیە لەکاتی تۆمارکردنی ناوی دانەر، نووسەر یان شوێنی نووسینیدا تووشی هەڵە دەبن و ئەم هەڵەیە لە تۆمارکردنی وردی زانیارییەکانی دەستنووسەکاندا دەبێتە هۆی ئەوەی دەستنووسەکە لە چاوی توێژەران بشاردرێتەوە. دیراسەی ئەم بابەتە و وردەکاری زیاتر پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ هەیە، بەڵام ئەو هەڵانەی کە لە تۆمارکردنی ئەو دەستنووسانەی کە مەلا مووسا نووسیونی، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

لە کتێبی فیهرستی دەستنووسەکانی کتێبخانەی دائیرەتولمەعارفی گەورەی ئیسلامی، کە خەڵاتی باشترین کتێبی ساڵی ئێرانی لەو ساڵەدا بەدەستهێناوە بۆ ناساندنی ناوی نووسخەهەڵگری دەستنووسی ژمارە ١٤٩١/٣ ئەمە نووسراوە.

موسی بن عبدالله الکلاشی الابوبکری کرد مظفر آبادی دشت جرم

بە لەبەرچاوگرتنی وشەکانی کورد و کلاشی، پێشبینیم کرد کە ڕەنگە مەلا مووسا کلاشی بێت. دوای چوونم بۆ کتێبخانە و بینینی لاپەڕەی کۆتایی ئەم دەستنووسە، بۆم دەرکەوت کە هەڵە لە خوێندنەوە و نووسینی ئەم بەشەدا هەیە. ئەوەی لە کۆتایی ئەم دەستنووسەدا نووسراوە بەم شێوەیە.

وەک دەبینن موزەفەر کە سیفەتی سەفەرە، بە هەڵە بە موزەفەر ئابادی تۆمار کراوە، دەشتی حوڕ کە دەشتێکی زۆر بەناوبانگە لە سەلاس باباجانی، بە هەڵە بە دەشت جەرم نووسراوە.

## مەلا مووسا و شیعر:

لەبەرئەوەی زۆربەی دەستنووسەکانی مەلا مووسا لە کتێبخانەی ناوەندی دائیرەتولمعارفی گەورەی ئیسلامیدان، لەلایەکی ترەوە یاسای ئەم کتێبخانەیە ڕێگەی پێنەدام فایلەکانی هەموو ئەو دەستنووسانە وەربگرم، بۆیە دوای ئاڕاستەکردنی چەند جار داواکاریی، دواجار ڕازی بوون بەوەی کە ڕاستەوخۆ سەردانی ئەو کتێبخانەیە بکەم و لەسەر کۆمپیوتەرەکەی ئەوێدا ئەو دەستنووسانە ببینم و بەڕێژەیەکی سنووردار ئەو لاپەڕانە دیاری بکەم کە پێموایە گرنگن، و وێنەی ئەو چەند لاپەڕە دیاریکراوە وەربگرم. لە ماوەی یەک ڕۆژ (بەیانی تاکوو کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ) لەو کتێبخانەدا، بە تامەزرۆییەوە هەموو لاپەڕەکانی ئەم دەستنووسانەم خوێندەوە. بەداخەوە لەنێو ئەو دەستنووسانەی کە بەخەتی مەلا مووسا نووسراون، نەمتوانی شیعرێکی کوردی هۆنراوەی ئەو بدۆزمەوە. بەڵام وەک شیعری فارسی، جگە لەو مەنزوومەی ئیستیعارە

که له سەرەوە بە کوتری باسم کرد و دواتر بە تەواوی دەیخەمەڕوو، ئەم چەند بەیتە فارسییەی لە کۆتا لاپەڕەی دەستنووسی ژمارە ١٤٤٨دا نووسیوە. هەرچەندە ناوەڕۆکی ئەم شیعرانە زۆر سادەن، بەڵام بەپێی مێژووی نووسینی دەستنووسەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فەقێیەتی و خوێندکاریی مەلا مووسا و، توانای شیعر وتنەوەی مەلا مووسا دەردەخات. هیوادارم بە دۆزینەوەی دەستنووسەکانی سەردەمی بەتەمەنیی و مامۆستای مەلا مووسا، شیعری پاراوی کوردیشی بدۆزینەوە. لە سەرووی یەکێک لەو شیعرە فارسییانەی کە لەم لاپەڕەدا نووسراوە و تاکە بەیتێکە، نووسیوویەتی "لکاتبة" و ئەم تاکە بەیتەش بەم شێوەیە:

لکاتبه

**ابم بود عبدالله موسی بنام   ز سرپان نوشتم علیک السلام**

لە خوار ئەم تاکە بەیتەوە دوو چوارینەی هێناوە و لە سەرووی هەردووکیشیان وشەی "لراقمه"ی بەکارهێناوە کە ئەوە دەردەخات کە شیعرەکە هی خۆیەتی. شیعرەکەی وەک ئەمەی خوارەوەیە:

لراقمه

**مرا داد توفیق رب ودود   نوشتم این تحفه اما چه سود**
**صبا مرگ به ناچار چار   کند جای ما زیر سنگ مزار**

لراقمه

**به لطف خداوند پروردگار   نوشتم من این حاشیه یادگار**
**بماند در دنیـــای دون   بلکه کسی را کند رهنمون**

مەلا مووسا و شیعرێک بە زمانی فارسی لە زانستی ئیستیعارەدا:

ئەم مەنزوومە شیعرییە لە ٢٣ بەیت پێکهاتووە و لە زانستی مێتافۆر (ئیستیعارە) و بە زمانی فارسییە کە مەلا مووسا خۆی هۆنیویەتییەوە، چونکە لە سەرووی نوسیویەتی "لراقمه موسی ابن مولانا عبدالله ابوبکری". دیارە بە خەتی بە خۆیشی نووسیویەتی. ئەم شیعرە لە یەک پەڕەدا بە ژمارە ١٤٤٨/٧ لە کتێبخانەی دائیرەتولمەعارفی گەورەی ئیسلامیدا هەڵگیراوە. گرنگی ئەم شیعرەی مەلا مووسا لەوانەیە لەوەدابێ کە زۆربەی زانایانی کورد بەشێوەیەکی سەرەکی شیعری فێرکارییان بە زمانی عەرەبی یان کوردی نووسیوە و مەلا مووساش یەکێکە لە کۆنترین و دەگمەنترین زانایانی کورد کە بە زمانی

فارسی شیعری لە زانستی ئیستیعارەدا نووسیوە. دەقی ساغکراو و وێنەی دەستنووسی ئەم شیعرە لە خوارەوە هاتووە.

منظومه استعاره

| | |
|---|---|
| به نام خداوند روزی رسان | کریم و بزرگ و کس بی کسان |
| به روح محمد که هردو سرای | بدو گشت پاینده فرخ لقای |
| بگویم که من چند بیت گزین | که در استعاره چون در پمین |
| به نزد خردمند در روزگار | بود هر یکی چون در شاهوار |
| ز بحث کنایه گشایم دهان | که تا باد مشهور اندر جهان |
| که پیش از همه چیز ای ذوالکمال | کنایه بدان تا شوی نیک حال |
| که تشبیه چیزی به چیز دیگر | بود در دل ای نور هردو بصر |
| از ارکان تشبیه مذکور نیست | به غیر از مشبه که میسور نیست |
| که تخییل هست یآن لوازم که | زود  برای مشبه به شد وجود |
| بگردانی اثبات ای نیک نام | برای مشبه دیگر والسلام |
| محقق بدان ای خردمند را | که تا آخرین سال از اند را |
| که مذکور سازی مشبه بهی | به قول گزین به وجه بهی؟ |
| ولیکن مشبه اراده کنی | سهل است هر گاه اعاده کنی |
| که ترشیح هست آن مجرده ولی؟ | کنی ذکر مشبه بهی |
| که تجرید آن است ای نیک رای | سرافراز باشی زهر دو سرای |
| که وصف مشبه به قول جلی | کنی ذکر او را به به لطف علی |
| بدان مطلقه آن بود در جهان | بود وصف اطراف جمله نهان |
| که شرط است در مطلقه استعار | نباشد ز اوصاف هیچ آشکار |
| به نظم آوردم این  نثر را | ندارد به لطف خدا کسر را |
| طلب دارم از طالبان زمان | که گر نیستند او ز نامحرمان |
| نشینند به یک فاتحه این حقیر | کنند یاد یکسر صغیر و کبیر |
| الهی آن کس که یادم کند | به یک مغفرت روح شادم کند |
| گزندش نباشد که در روزگار | به ایمان کامل شود رستگار |

کۆتایی: مەلا مووسا کڵاشی یەکێکە لە زانایانی کوردی ناوچەی جوانڕۆ کە لە کۆتاییەکانی سەدەی دوازدەهەم و تا ناوەڕاستی سەدەی سیازدەهەم لە ژیاندا بووە. سەرەڕای ئەوەی کە کۆمەڵێک بەرهەمی بە خەتی خۆی نووسیوەتەوە، بەڵام بە نەناسراوی مابوویەوە تا بە فەزڵی خودا ئەم لێکۆڵینەوەیە بە کورتی هەندێک لایەنی ژیان و بەرهەمەکانی ناساند. بهپێی ئە م لێکۆڵینەوەیە، ئەم زاتە کوڕی مەلا عەبدوڵڵای گەورەی کڵاشی و برای مەلا عیسای زانا و شاعیرە. بەگشتی ١٣ دەستنووسی لێی بەجێماوە، کە تێیاندا وەک نوسخەهەڵگر (کاتب) ڕۆڵی هەبووە. لە پەڕاوێزی ئەم دەستنووسانەشدا بەشێک لە شیعری هۆنراوەی خۆیی نووسیوە کە لەم لێکۆڵینەوەیە ناسێندران. هیوادارم ئەم توێژینەوەیە بتوانێت ببێتە سەرەداوێک بۆ بەدەستهێنانی زانیاری زیاتر لەسەر ژیان و بەرهەمی ئەم کەسایەتییە گەورەیە لە داهاتوودا.

## سەرچاوەكان

**دەستنووس:**


- ابن الحاج، محمد بن حسن. رفع الخفا عن ذات الشفا فى سيره المصطفى، کتابخانه علامه طباطبایی شیراز، کاتب: عیسی بن عبدالله، ۱۲۳۹ ه.ق، شماره ۱۶۷۸.

- ابوالبقاء، حاشیه شرح الرساله الوضعیة العضدیة، کتابخانه دائرة المعارف بزرگ اسلامی، کاتب: موسی بن عبدالله بن محمد صالح، ۱۲۰۸ ه.ق، شماره ۱٤٤۸/۳.

- ابوبکری، موسی بن عبدالله، استعاره منظوم، کتابخانه دائرة المعارف بزرگ اسلامی، ۱۲۰۸– ۱۲۰۹ ه.ق، شماره ۱٤٤۸/۷.

- خیالی، احمد بن موسی، حاشیه شرح العقاید النسفیة، کتابخانه دائرة المعارف بزرگ اسلامی، کاتب: موسی بن عبدالله بن محمد صالح ، ۱۲۱۱ه.ق، شماره ۱٤۷٤/۱.

- دشتکی شیرازی، آداب البحث و المناظره، کتابخانه دائرة المعارف بزرگ اسلامی، ۱۲۰۸ه.ق، شماره ۱٤۹۲/۱.

زیباری، حسن بن محمد، حاشیة شرح رساله الاستعاره، کتابخانه دائرة المعارف بزرگ اسلامی، کاتب: موسی بن عبدالله بن محمد صالح، ۱۲۰۸– ۱۲۰۹ ه.ق، شماره ۱٤٤۸/۸.

سیالکوتی، عبدالحکیم بن شمس الدین، زبده الأفکار، کتابخانه دائرة المعارف بزرگ اسلامی، کاتب: موسی بن عبدالله الابوبکری، ۱۲۱۰ ه.ق، شماره ۱۱۹۷.

زبده الأفکار، کتابخانه دائره المعارف بزرگ اسلامی، کاتب: موسی بن عبدالله بن محمد صالح کلاشی ابوبکری، ۱۲۱۲ه.ق، شماره ۱٤۷٤/۳.

صفدی، محمد بن عبدالرحمن، رحمه الامه فی اختلاف الأئمة، کتابخانه مرکز مطالعات و تحقیقات اسلامی، کاتب: موسی بن عبدالله بن محمد صالح بن مصطفی الکلاشی، ۱۲٦۰ ه.ق، شماره ۷٥٥.

عصام الدین اسفراینی ، ابراهیم بن محمد، شرح رساله الاستعاره، کتابخانة دائرة المعارف بزرگ اسلامی، کاتب: موسی بن عبدالله بن محمد صالح، ۱۲۰۹ ه.ق، شماره ۱٤٤۸/٦.

فناری، محمد بن حمزه، شرح الایساغوجی، کتابخانة دائرة المعارف بزرگ اسلامی، کاتب: موسی بن عبدالله بن محمد صالح کلاشی الکلاشی الابوبکری، ۱۲۰۸ه.ق، شماره ۱٤۹۱/۱.

قول احمد، احمد بن محمد، حاشیة الفوائد الفناریة، کتابخانه دائرة المعارف بزرگ اسلامی، کاتب: موسی بن عبدالله الکلاشی الابوبکری کرد مظفر آبادی دشت جرم، ۱۲۰۸ه.ق، شماره ۱٤۹۱/۳.

کورانی، یوسف بن محمود، حاشیه حاشیه الخیالی علی شرح عقائد النسفی، کتابخانه دائرة المعارف بزرگ اسلامی، کاتب: موسی بن عبدالله بن محمد صالح الکلاشی وطنا، ۱۲۱۲ه.ق، شماره ۱٤۷٤/۲.

لیث سمرقندی، ابوالقاسم بن ابی بکر، شرح الرساله الوضعیة العضدیة، کتابخانه دائره المعارف بزرگ اسلامی، کاتب: موسی بن مولانا عبدالله بن محمد صالح بن مصطفی بن حسین کاشانی، ۱۲۰۸ ه.ق، شماره ۱٤٤۸/۱.

ئامادەکردنی: عادل صدیق

# ڕۆژی تاریك و شەوی ڕووناك

## کیمیابیبارانی هەڵەبجە لە بیرەوەری شایەتحاڵێکدا (١)

ئەم چاوپێکەوتنە شەوی ٢٦-٢٠٢١/١١/٢٧ لە ماڵەکەی خۆیان لەگەڵ بەڕێزیان ئەنجامدراوە.

**پرسیار/ ئەکرێ خۆتان بناسێنن؟**

وەڵام/ من ناوم مستەفا ڕەشید محەمەد ئەحمەدە، ساڵی ١٩٤٩ لە گوندی عەبابەیلێ لەدایکبووم. ئێمە پێنج براو سێ خوشکین، براکانم بریتین لە: عەبدوڵڵا، ڕەسوڵ، حەمەحسێن و حەسەن، خوشکەکانیشم ناویان: خەدیجە، بەهیە و ناهید. باوباپیرمان لە سەردەمی عوسمانییەوە لە عەبابەیلێ ژیاون. ئێمە سەر بە هۆزی سۆفی ئەحمەدین، واتە سۆفی ئەحمەد باپیرە گەورەمانە.

من خۆم ساڵی ١٩٧١ گواستوومەتەوە بۆ ناو شاری هەڵەبجە، ماڵمان لە گەڕەکی پاشا بوو لای مزگەوتی شافیعی. ئەو ناوچەیە قەبرسانێکی کۆنی لێ بوو، گردۆڵکەیەک بوو، ناوی گردە قوڵگە بوو، ماڵی من یەکەم خانوو بوو لەبەری ئەو قەبرسانەوە.

**پرسیار/ ئێوە بۆردومانی ١٩٧٤ لەبیرە؟**

وەڵام/ شەوێک بەر لە بۆردومان ڕادیۆی شۆڕش ئاگاداری کردینەوە کە قەڵادزێ بۆردومان کراوە و ئەگەری هەیە هەڵەبجەش بۆردومان بکرێ. خەڵکێکی زۆر بەگوێی کردن ئەڕۆیشتن و دەهاتنەوە، ئێمەش لەکاتی بانگی مەغریبدا ڕۆیشتین بۆ ماڵی خەزورم کە ئەوکات لە عەبابەیلێ بوون، لەوێ ماینەوە تا عەسر، تا فڕۆکە هاتوو بۆردومانی کرد، کە بۆردومانەکەیان تەواوکرد و ڕۆیشتن ئێمە بەپەلە گەڕاینەوە بۆ ناو هەڵەبجە، سەیرم کرد ماڵی حاجی فەتحوڵڵا ناپاڵم لێی داوە، گوێم گرت لەژێر داروپەردووی خانووەکەیاندا دەنگی خەڵک ئەهات، منیش دەستم کرد بە لابردنی داروپەردووی خانووەکە تا فەردە توونتن دەرکەوت، حاجی فەتحوڵڵا کەسێکی دەوڵەمەند بوو توتنی ئەکڕیی و دەیفرۆشتەوە، لە خانووەکەیدا مەخزەنی هەبوو، لەسەر فەردە توتنەکان کەسێک کەوتبوو ناوی دلێری مەلا محەمەدی باش کاتب بوو، سەیر ئەوەبوو دلێر هیچی لێ نەهاتبوو، تەنها کەمێک ئەشەلی، سواری پیکابێکیان کرد و بردیان بۆ نەخۆشخانەکەی تەوێڵە.

ئەو حاجی فەتحوڵڵایە خەڵکی هەڵەبجە بوو، بە حاجی فەتحوڵڵای ئاش ناسرابوو، چونکە ئاشی سەهۆڵی هەبوو، دوکانی سەهۆلی فرۆشتنەکەی دەکەوتە پشت چایخانەکەی ئێستای ئەحمەد شەماڵەوە، ماڵیشیان دەوکەوتە لای شارەوانی ئیستا.

بەنیسبەت ئێمەوە هیچ خزمێکی نزیکمان بەر ئەو بۆردومانە نەکەوت، بەڵام لە عایلەی ماڵی کامیلی حاجی عەلی کە پێشتر وەزیری ئەوقاف بوو خوشکەزایەکی بەناوی حەمەڕەشید سەید قالەی چایچی تیاچوو، خوشکێکی دیکەی کامیلی حاجی عەلی بەناوی (گوڵە) شووی کردبوو بە پیاوێک پێیان ئەگوت عەلە جولەکە، خەڵکی ئەم ناوچە نەبوو بە سوتفە کەوتبووە ئەم ناوچەیە و خوشکەکەی کامیلی مارەکردبوو منداڵێکیان شەهید

بوو، هەروەها سەید قادری هانەسوورەش بەر بۆردومانەکە کەوتووو شەهید بوو، تەقریبەن ٥٢ هاوڵاتی لەو بۆردومانەدا شەهیدبوون. بۆردومانەکە تەنها ناو شاری گرتەوە و عەبابەیلێی ئێمەی نەگرتەوە.

دوای بۆردومان خەڵکێک کە پێشتر شاریان بەجێهێشتبوو گەڕانەوە بۆ ناو شار، خەڵکێکی زۆریش هەڵەبجەیان بەجێهێشت، بەشێکیان گەیشتنە سەرپێڵی زەهاو لە نزیک کرماشان، ئێمەش ڕۆیشتین هەتا گوندی سازان کە نزیکە لە ئاوی سیروان، کوڕێکم کە ئێستا مفەوەزە لە نفووسی سیروان ئەوکاتە لە بێشکەدا بوو، زۆر نەخۆش بوو، دوای چوار ڕۆژ مانەوە لە سازان گووتم ئەیبەمەوە با لە عەبابەیلێ بمرێ، خەڵکی سازان وڵاخیان هەبوو، سواری وڵاخێکم کرد و هێنامەوە بۆ عەبابەیلێ و لەوێ دوو ڕۆژ ماینەوە، دواتر من گەڕامەوە بۆ ناو شار، چونکە لەگەڵ کوڕێکی زاوامان لەناو شار چایخانەم هەبوو، من چایخانەکەم کردەوە، بەڵام زاواکەم بەماڵەوە ڕۆیشت بۆ سەرپێڵی زەهاو. ئەوانەی کە چوونە خاکی ئێران بەشێکیان لە ڕێگەی گوندی سازانەوە و بەشێکیشیان لە ڕێگەی هاوار و تەوێڵەوە ڕۆیشتن.

دوای ئەو بۆردومانەی ناو شار، ناوبەناو ئێواران فڕۆکە ئەهات کەشفی ناوچەکەی ئەکرد و ئەگەڕایەوە، جارجاریش سوکە بۆردومانێکیان ئەکرد، ڕۆژێکیان فڕۆکەیەک هات، خەڵکی لەوکاتەدا خەریکی دۆمینە و  چا خواردنەوە بوون، دوای ئەوەی کە ئاسمانی شاری بەجێهێشت دەنگێکی گەورە هات و هەڵەبجە بەجارێک لەرییەوە، کوڕێک لە چایخانەکەی من چوویە دەرەوە بۆئەوەی سۆراغی دەنگەکە بکات، چووە سەربانی مزگەوتی پاشا کە دوو قات بوو، دوای ماوەیەک هاتەوە، وتی قەسفی شەخسەکەی سەیدسادقی کردووە.

**پرسیار/ چەند ساڵ سەربازیت کردووە؟**

وەڵام/ هەشت ساڵ سەربازیم کردووە، بەڵام هەمووی بەسەریەکەوە نەبووە، لە ١٩٦٨/١/١٥ بردمیان بۆ عەسکەری بۆ ناسرییە، تازە خێزانم پێکهێنابوو هەمووی سێ مانگ بوو ژنم هێنابوو، شەش مانگ جارێک بە ئینجازە ئەهاتمەوە، جارێکیان هاتمەوە منداڵێکمان لەدایک ببوو، کە ڕۆیشتمەوە و جاری داهاتوو گەڕامەوە وتیان منداڵەکەت مردووە خۆت خۆش، جگە لەو جارە، سێ جاری تریش من براوم بۆ عەسکەری بۆ ئیحتیات، ئەمانەی دواتر بەزۆری لە ساڵانی جەنگی عێراق و ئێراندا بووە. بەدرێژایی ساڵانی جەنگ لەلایەن ئێرانەوە بۆردومانی هەڵەبجە ئەکرا، کە پێیان ئەگووت بۆردومانی مەدەنی، لە یەکێک لەو بۆردومانانەدا تۆپێک دای لە ماڵی ئێمە.

ساڵی ١٩٨٦ من فیراربووم، دوکانێکم گرتبوو لە سەید حەمەساڵحی کانی توو، ئەوکات دوکانی بایەعی هەبوو لەبەرئەوەی خەریکی توتن کردن بوو لە دەڵێن نەیدەپەرژایە سەر دوکانەکە، بۆیە دای بەمن بە کرێ، من دوکانەکەم لێ گرت و بایەعییەکەی ئەوم دابەش ئەکرد، دەبوو من مانگانە بیست دیناری بایەعییەکە و چواردە دیناریش هەقی کرێی دوکانی پێ بدەم، یەکەم مانگ ٢٠٠ دینارم پێ دا ئەوە لەکاتێکدا ئەبوو بیست دینارم پێ بدایە، ئەو فەقیر بوو هەویەی جگەرەی هەبوو، هەویەکەمدا بە برادەرێک بەناوی قادرە شەل، قادر ئیشی جگەرەی ئەکرد، ئەویش ٣٠٠ دیناری دایە دەستم. ڕۆژانە خەڵکێکی زۆری ئەو مەنتیقە ئەهاتنە لام و لە دوکانەکە دائەنیشتن، منیش ڕێزێکی زۆرم لێ ئەگرتن و یارمەتیم ئەدان، خوێنەواریشم هەبوو بۆ کاروباری بایەعییەکە.

ڕۆژێکی ساڵی ١٩٨٦ ئێران بە تۆپ قەسفی هەڵەبجەی کرد، تۆپی یەکەم نەمانزانی لە کوێی داوە، تۆپی دووەم کە لەناو شار کەوتەوە، لە دوکان هاتمە دەرەوە، دووکەڵ بە ئاسمانەوە بوو، بەڵام هیچ دیار نەبوو، من خۆم لە پیرمحەمەد بووم ماڵیشمان لای مزگەوتی شەهیدان بوو، ئەو ڕۆژە کوێخا حەمەسەلام لە دوکانەکەی من دانیشتبوو، وتم کاکەحەمە ئەو تۆپە داویەتی لە ماڵی ئێمە، وتی نازانی قسەی باش بکەی قسە خراپ مەکە، وتم وەڵا داویەتی لە ماڵی ئێمە، دوکانەکەم داخست و بەناو بازاڕدا ڕۆیشتم بەرەو ماڵەوە، لەوکاتەشدا بۆردومانی هەر بەردەوام بوو، هاتم هەتا گەیشتمە مەکتەبی بورهان سەیرم کرد قیژە و دەنگی تەلەبەکان دێ، بە جانتاوە وەستابوون و مامۆستاکانیان نەیاندەهێشت بێنە دەرەوە، وتم تەلەبەکانی کۆڵانی خۆمان هەمووتان وەرن جانتاکانتان بدەن بەمن و لە پێشمەوە ڕاکەن، کە نزیکی ماڵی خۆمان بوومەوە سەیرم کرد خەڵکێکی زۆر لە ماڵی ئێمە کۆبوونەتەوە، توومەز تۆپێک دابووی لە ماڵی ئێمە، سەلامی کوڕە بچووکم لە خەودابوو، تۆپی یەکەم دابووی لە خوار ماڵمان ئەویش بەخەبەر هاتبوو ڕایکردبوو بۆ ژێرزەمینەکە، تۆپی دووەم دابووی لەو ژوورەی سەلام کە لێی خەوتبوو، بەڵام ئەو ڕۆیشتبوویە ژێرزەمینەکەوە و بەوهۆیەوە سەلامەت بوو.

ئەو ڕۆژە ماڵی ئێمە ئەو تۆپەی بەرکەوتبوو، گەڕەکەکەشمان تۆپی زۆر بەرکەوت و زۆر ماڵی وێران کرد، هەر بەهۆی ئەو تۆپبارانانەوە لە کۆڵانی ئێمە کوڕێکی عەلی حەمەساڵحی شاوەیس و کوڕێکی کاک فەتاح شەهید بوون. ڕۆژێک لیژنەیەک هات بۆ تەعویزکردنی ئەو تۆپەی بەر ماڵی ئێمە کەوت، وتیان حاجی مستەفا ئەم خانووە هی تۆیە، وتم بەڵێ، وتیان چەندی تێچووە، وتم دینار و نیوێک، وتیان کاک مستەفا گاڵتەمان پێ دەکەیت، وتم نەوەڵا، وتی ئەی دینار و نیوێک بەشی چی ئەکات، وتم بلۆکی خۆڕاییان

بۆ هێناوم، وەستا پارەی لێ نەسەندوم، تەنها یەک دینارم داوە بە فەردەیەک کەچ، وتیان لەبەرئەوەی ئەوەندە ڕاستگۆی ئەوە شەش مەتر موکەعەبت بۆ ئەنووسین، دوای ماوەیەک پارەی تەعویز هاتەوە ٨٠٠ دینار بوو، هەموویان وەریانگرت، بەڵام من وەرم نەگرت، لەبەرئەوەی عەسکەری فیرار بووم دەستم لەو پارەیە هەڵگرت و نەڕۆیشتم وەریبگرم، وتم لەوانەیە بمگرن. ئەگەرچی ئەوکات حکومەت زۆر گوێی بەفیرار نەئەدا، ژمارەیەکی زۆری فیرارەکان وەرەقەی جاش و مستەشاریان لەگیرفاندا بوو، لەلایەکی دیکەشەوە ئەترسان بڕۆن بۆ ناو پێشمەرگە یاخود بۆ ئێران، بۆیە زۆر گوێیان پێ نەئەدا.

**پرسیار/ ئێوە ئاگاداری خۆپیشاندانەکانی ١٣ی ئایاری ١٩٨٧ بوون؟**

وەڵام/ ڕۆژێک بەر لە خۆپشاندان، ڕایانگەیاند کە سبەی لە گەڕەکی کانی عاشقان خۆپیشاندان ئەکرێ، بەزۆری شیوعییەکان کردیان، نیوەڕۆکەی هەلیکۆپتەر هات قەسفی کردن، جەماعەتی مامۆستا عوسمان و مەلا عەلی ڕۆیشتن بۆ ئێران، حاجی حەسەن و حەمەحسێنی برام لە ترساندا بەدوایاندا ڕۆیشتن، ئەو ڕۆژە ئێمەش ڕۆیشتین بۆ عەبابەیلێ و هەتا ئێوارەکەی لەوێ ماینەوە دواتر گەڕاینەوە بۆ ناو شار.

لە سەرەتاوە منیش بەشداری خۆپیشاندانەکەم کرد، لە کانی عاشقانەوە ڕۆیشتین بۆ ناو بازاڕ، بەڵام حکومەت خێرا خۆپیشاندانەکەی سەرکوت کرد، دواتر بە شۆفڵ ژمارەیەکی زۆر خانووی لە گەڕەکەکانی کانی عاشقان و مۆردانە ڕووخاند و تەخت کرد، هەروەها ژمارەیەک خەڵکیان گرت و بردنیان بۆ پشت گوندی بامۆک لەوێ زیندەبەچاڵیان کردن، کە بەشێکیان لە بریندارەکانی ئەو ڕۆژە بوون و لەناو نەخۆشخانەی عەنەبدا دەریان هێنان و بردنیان، دواتر حکومەت مەنعەتەجەولی ڕاگەیاند، خەڵکێکی زۆری گرت و لە مونەزەمەکەی پشتی قوتابخانەی هەڵەبجەی کچانی ئێستا سجنی کردن، هەر لەم خۆپیشاندانانەدا چاوی کچێکی ماڵی سەید حەمەساڵح کوێر بوو.

**پرسیار/ ئەو چەند ڕۆژەی بەر لە کیمیابیباران بارودۆخی هەڵەبجە و دەوروبەری چۆن بوو؟**

وەڵام/ برایەکی ئەم خێزانەم بەناوی سەباحی حاجی سەعید هێستریکی پێ بوو، خەریکی کەسابەت بوو، هاتوچۆی هاواری ئەکرد و کەلوپەلی ئەفرۆشت، هات خەبەریدا بەماڵی باوکی خێزانم، وتی با بڕۆم لەو مزگەوتەی عەبابەیلێ جاڕ بدەم بڵێم ئێران هێرش ئەکات، بەڵام خەزورم نەیهێشت، وتی لەوانەیە ئەم هەواڵە ڕاست نەبێت، سەباح زۆر هەوڵیدا لەگەڵ خەزورم کە ئەو شەوە لە ماڵی خۆیان نەخەون، چونکە ماڵیان لە نزیک معەسکەرەکەی عەبابەیلێ بوو لە چەمی دەڵەمەڕ، دڵنیاش بوو کە هێرش ئەکرێت،

هەوڵیدا بیانبات بۆ ماڵی خۆی، بەڵام خەزورم ڕازی نەبوو، ئەو شەوە خێزانم بە سەردان چووبووبوویەوە بۆ ماڵی باوکی ، ئەویش لە ماڵی باوکی مابوویەوە و شەو لەویٚ خەوتبوو، لە نیوە شەودا قەسف لە باڵانبۆوە دەستیپێکرد، ڕۆژی پانزەی مانگ پاسداری ئێران هاتبوونە ناو گوندی عەبابەیلێ و داوای جلی کوردیان کردبوو، بێ نان و ئاو بوون، لەهەمانکاتیشدا زیلی عەسکەری هاتبوو بۆ ناو عەبابەیلێ و بە خەڵکیان گووتبوو وەرن با بتانبەین بۆ ناو شار، خێزانم براو خوشکەکانی لەگەڵ خۆی هێنابوو و هاتەوە بۆ ناو شار بۆ ماڵی خۆمان، بەڵام خەزورم و خەسووم لەبەرئەوەی حەیوانیان هەبوو لەوێ مابوونەوە، ئێوارەکەی خەزورم چووبوو ئالف بدات بە حەیوانەکان، لەوکاتەدا ئێران بۆردومانی معەسکەرەکەی دەڵەمەڕی کردبوو، هەندێک لەو تۆپ و ڕاجیمانە دابووی لە عەبابەیلێ، تۆپێکیان لە نزیک ماڵی خەزوورم کەوتبووە خوارەوە و بەوهۆیەوە خەزوورمی کوشتبوو، لەبەرئەوەی ترسەکە زۆربوو تەنها دوو کەس چووین بۆ سەر قەبران و لە گۆڕستانەکەی نزیک مزگەوتی شەهیدان بەخاکمان سپارد.

دوای ناشتنەکە، ئێمە گەڕاینەوە بۆ ماڵی خۆمان، لە ترسی بۆردومان نەماندەوێرا بێینە دەرەوە، بەهۆی مردنی خەزوریشمەوە لە ماڵی برایەکی خێزانمدا دانیشتووین تەعزیەمان هەبوو، نەدەهاتینە دەرەوە، بەڵام گوێمان لە دەنگی (الله أکبر)ی پاسدار بوو کە بە کۆڵانەکاندا ئەهاتن و ئەڕۆیشتن.

**پرسیار/ ئێوە کە ئەتانزانی پێشمەرگە و پاسدار هاتوونەتە ناو هەڵەبجە، ترسی ئەوەتان نەبوو حکومەتی عێراق بۆردومانتان بکات وەک ئەوەی ساڵی ١٩٧٤ ڕوویدا؟**

وەڵام/ تەیارە دەهات بەس قەسفی نەدەکرد، کەشفی ئەم ناوچەی دەکرد تا بزانێت جەیش لەکوێ هەیە و دەگەڕایەوە. بەچاوی خۆم بینیم لە ئێوارەی پانزدەی مانگ سێ هەلیکۆپتەر عەسکەریان هێنا، لەبەینی جەلیلە و عەنەبدا دایانبەزاندن بۆئەوەی بەرگری بکەن لەم ناوچەیە، ئەوان نەیانزانی بوو تەسلیم بووە و هەمووی گیراوە، هەر دوای دابەزاندنیان هەموویان لەلایەن پاسدارەوە کوژران و بەدیلگیران.

ئێمەش هەر لە ماڵەوە ماینەوە، هەوڵیشمان نەدا لە شار بچینە دەرەوە، وتیان ناوچەکە ئازاد بووە، ئەگەر هەوڵیشمانبدایە بڕۆین نەیاندەهێشت دەیانگێڕاینەوە، چونکە لە عەبابەیلێ و دەڵەمەڕ و شنروێ و لەو شاخەی کە دەچێتە سازان خەڵکیان گێڕابوویەوە، خەڵک هەبووە لە شنروێ وە هێناویانەتەوە لە کیمیابارانەکەدا مردووە. جگەلەوەش ئێمە تەعزیەمان هەبوو، هەموومان تابەیانی لە ماڵی ژن براکەم بووین، بەترس و لەرزەوە هەرکەسە و بەشێوازێ خەوتبوو تا ڕۆژبوویەوە. بەیانی ١٦ی ئازاریش ئێمە هەر لە ماڵ

نەهاتینە دەر، تەعزیەمان دانابوو هەتا بۆردومان دەستپێکرد. خزم و کەسە نزیکەکانمان دەهاتن بۆ پرسەکە.

ئەو بەیانییە(٣/١٦) برایەکی خێزانم چووبوو بۆ عەبابەیلێ بەدوای خەسومدا بۆئەوەی بیهێنێت بۆ هەڵەبجە، ژنبراکەم بڕێکی زۆر ئاڵتونی ژنەکەی پێ ئەبێ و لە گیرفانیدا هەڵی گرتبوو، وتبووی لەوانەیە جارێکی دیکە نەگەڕێمەوە ماڵەوە، کاتێک لە عەبابەیلێ وە لەگەڵ خەسوم و برایەکی دیکەیدا گەڕابوونەوە، پاسدار گرتبوونی، پارە و ئاڵتونەکانیان لێ سەندبوون، میلی سیلاحیشیان لێ ڕاکێشابوون وتبوویان هەرکەسێکتان بێت بەدوامانداتەقەی لێ دەکەین. خەسوم و کوڕێکی بەناوی فاروق لای حەیوانەکان بەجێ مابوون، پاسدار هاتبوو گرتبوونی بردبوونیان بۆ شاخی شنروێ، حەیوانەکانیشیان بردبوو نەیان گێڕابوونەوە بۆیان، کە چوار مانگای دۆشین و بیست سەر بزن بوو، لەگەڵ حەیوانەکانیشدا ماڵەکەشیان تاڵان کردبوون.

خەریک بوو جەنازەکەی خەزوریشم بەرن بۆ ئێران، بەڵام کوڕێکی دراوسێیان بەناوی عوسمانی حەمەساڵح نەیهێشتبوو جەنازەکەی بەرن. دواتر کوڕێکی تر بەناوی ڕزگار غەفور کەریم سەیری کردبوو لاشەی خەزوورم لەبەر ماڵەکەیاندا کەوتووە، جێبێکی پێ ئەبێ، خستبوویە ناو جێبەکەوە و هێنایەوە بۆ هەڵەبجە. جگە لەوانەی ئێمە خەڵکی دیکەش ڕووت کرابوونەوە و پارەیان لێ سەندرابوو.

**پرسیار/ بەیانی شانزەی مانگ ئێوە لە ماڵەوەبوون؟ هەوڵتان نەدا بێنە دەرەوە؟**

وەڵام/ هەر لە ماڵەوە بووین و نەهاتینە دەرەوە، بەتەماش نەبووین لە شار دەرچین هەتا فڕۆکەکان لە سەعات ١١:٤٠ی خولەکی نیوەڕۆدا هاتن. فڕۆکەکان زۆربوون، بەڵام من دووانیانم بینی، سەرەتا لە چواردەوری مەرکەزی پۆلیسیاندا ڕووە و ئەو گەڕەکە ڕۆیشتن بەرەو پشتی مزگەوتی شافیعی، لەوێدا ماڵی پۆلیسێکی لێبوو بەناوی ئەحەی قالە، لەو بۆردومانەدا شەهید بوو، لەو مەنتیقەدا ماڵی خەزوورم خانوویەکیان هەبوو دابوویان بەکرێ بە ژنێک، ناوی دادە گوڵە بوو، دادەگوڵە ژنی کاک حسێن بوو، کچێکی ئەوانیش بەناوی حەمدییە شەهید بوو، کوڕێکیشی برینداربوو، ئێستاش لەسەر جێگا کەوتووە، چەندین عەمەلیاتیان بۆ کردووە، بەڵام هەر چاک نەبووەتەوە، ئەمە هەمووی لە یەکەم بۆردوماندا ڕوویاندا. کە بۆردومان دەستیپێکرد وتم کەس نەچێت بۆ ژێر زەمینەکە، وتم کێ ئەتوانێ بابڕۆین بۆ دەرەوەی شار، نوری ڕەشەی حاجی خەزووری سەلاحی خەزوورم، تراکتۆرێکی هەبوو، تراکتۆرەکەی هێنا، وتی سەرکەون، ئێمەش سەرکەوتین هیچمان لەگەڵ خۆمان نەبرد. ئەوانەی چووینە ناو مەکینەکە ئەمانەبووین: ماڵی ئێمە،

ماڵی سەلاحی خەزوورم، ماڵی کاک نوری خۆیان و ماڵی لەتیفی کوڕی، لەڕێگاشدا ماڵی عەبدوڵڵای خاڵۆ عەلە و ماڵی دادە ئامین لەقەبی ئامەکوڵ بوو ئەمانەبووین. نەشماندەزانی کە کیمیایی دەوەشێنێت. ڕاستە پێشتر من عەسکەریم کردبوو، زانیاری ئەوەم هەبوو لەسەر کیمیایی ئەگەر وەشاندیان هەتا ئەتوانی بچۆرە شوێنی بەرز و پەڕۆیەکی تەڕ بگرە بە دەموچاوتەوە، بەلام نەمدەزانی کە ئەیکەن بەسەر خەڵکی مەدەنیدا.

کاتێک لە ماڵ دەرچووین جگە لە پارە و تەسکەرەکانمان هیچ شتێکی دیکەمان پێ نەبوو، لە نزیکی سەعات دوانزدە بەڕێکەوتین تاگەیشتینە پشتی عەبابەیلێ تەیارەکان هاتنەوە، لەڕێگادا پێشمەرگە و پاسدارمان ئەبینی بەرەو خوار دەهاتن بۆ ناو هەڵەبجە، بەلام نەتدەزانی کامە پێشمەرگەیە و کامە پاسدارە. لەوێ لە شوێنێک دابەزین پێی دەڵێن هەوارگەی شێخان، ئێمە پێش هەموو کەسێک گەیشتینە ئەوێ، واتە خەڵکی لێ نەبوو، بەلام پاسداری لێ بوو کۆپتەرێکیش لە شنروێ نیشتبوویەوە. لە هەوارگەی شێخانەوە سەیری هەڵەبجەمان دەکرد چۆن فڕۆکەکان هەر لە گوندی باوەکۆچەکەوە هەتا ئۆردووگای عەنەب پیایدا هاتن. فڕۆکەکان پۆل پۆل ئەهاتن، پۆلی وایان هەبوو دە فڕۆکە ئەبوو، تیابوو هەشت فڕۆکە ئەبوو، جارجاریش کەمتر ئەبوونەوە، لە بالانبۆ و پریس و تریفە و ڕێگەی دەربەندیخانەوە ئەهاتن، بۆردومانیان ئەکرد و لە هەمان ڕێگەوە ئەگەڕانەوە.

بەوشێوەیە ئێمە هەتا نزیکی عەسر لەوێ ماینەوە، بەدرێژایی ئەو ماوەیە سەیری هەڵەبجەمان دەکرد و باوکەڕۆ و براڕۆمان بوو. پەیتا پەیتاش خەڵک ئەهاتن بەرەو عەبابەیلێ، خەڵکم دەبینی بەلێشاو لە شار دەردەچوون بەرەو عەبابەیلێ و عەنەب و بالانبۆ و باوەکۆچەک دەڕۆیشتن، ئەگەر ئەو ئێوارەیە بۆردومانی عەبابەیلێی بکردایە سێ ئەوەندەی دیکە خەڵک تیائەچوو، بەس عەنەب و هەڵەبجەی کیمیاباران کردبوو، ئێمەش نەماندەزانی کە کیمیایی لە هەڵەبجە داوە. کەس لە عەبابەیلێ نەدەمایەوە هەمووی هەوڵی ئەدا بەرەوسەر بۆ شاخی شنروێ بڕوات، ئێمە خۆمان یەکەم کەس بووین دوای عەسر چووین بەرەو شاخی شنروێ. ترسی ئەوەشمان هەبوو کە فڕۆکەکان بۆردومانمان بکەن.

بەدوای ئێمەشدا خەڵک پەیتا پەیتا دەهاتن، لەوکاتەشدا مامەم عەمری خوای کردبوو، ئامۆژنم دەیگووت دنیا هەستێ من نایەم، بە هەزار حاڵ ڕۆیشتین، ئێمە ئەو تراکتۆرە گەیشتە فریامان، چونکە هەر بەو تراکتۆرە ڕۆیشتینە سەرەوە بۆ سەر لوتکەی شاخی شنروێ، ئێوارە داهات کیمیایی دابووی لە هەڵەبجە ئێمەش ئاگامان لە هیچ نیە، ڕێگایەک هەیە لەولای شنروێ وە دێتەوە خوارەوە پێی دەڵێن کلاش دڕ، ڕێگاکە دێتەوە گامەخەلان لەوێشەوە دێتەوە چەمی دەڵەمەڕ، هەمووماس بەو ڕێگایەدا بە تراکتۆرەکە هاتینەوە

خوارەوە، لە ڕێگا دایکم لەگەڵ ژنێکی دیکە بەناوی دادە ئامینە بوو بە شەڕیان، دایکم بە دادە ئامینەی دەگووت تەوقەیەک بەسەرتەوەیە بریقە ئەداتەوە لێی بکەرەوە با تەیارەکان نەیبینن و بۆردومانمان بکەن، ئەوەندە ئەترسا، هیچ وەسیلەیەکی ڕووناککەرەوەشمان پێ نەبوو، بۆ بانگی مەغریب هاتینەوە عەبابەیلێ، وتمان چوارمان ئەڕۆین کەلوپەل دەهێنین، چونکە هیچمان پێ نەبوو، سەیرمانکرد باوکەڕۆ و براڕۆیە، پورێکی خێزانم ناوی سۆیبە بوو، بە کۆڵ هێنایان بۆ ناو ئێمە، کیمیایی لێی دابوو، گیانی ئەدا، وتمان ئەگەر عەمری خوای کرد لەم حەوشەی ماڵی باوکی خێزانمدا ئەینێژین، بەڵام نەمرد، ئەمجارە هەستاین سەیرمان کرد هەڵەبجە کیمیاباران کراوە تازە ناتوانین بیینەوە، بانگی عیشا جارێکی تر سواری تراکتۆر بووین و لە چەمی دەڵەمەڕەوە ڕۆشتینە سەرەوە بۆ ڕێی سازان بەو شەوە لەوێوە ڕۆیشتین تا گەیشتینە سازان. لەڕێگا خەڵکمان ئەبینی بە باوکەڕۆو براڕۆیان بوو، خەڵکیشمان ئەبینی ئاگری کردبوویەوە و ئەگریا و ئەیووت کوڕەکەم دیار نییە، جەنازەشی لێبوو کە کیمیاییەکە لە ڕێی سازان لێی دابوون و هێنابوویان لەوێ مردبوو.

**پرسیار/ تراکتۆرەکەتان لایتی هەڵکردبوو؟**

وەڵام/ بەڵێ ئیشی دەکرد، تەیارە زۆر گوێی بە لایتی بچووک نەئەدا، بۆ قەرەباڵغی ئەگەڕا. بەشەو کەمتر ئەهاتن و ئەگەڕان، بەڵام نزیک بانگی مەغریب کە لە چەمی دەڵەمەڕ هاتینە خوارەوە فڕۆکەیەک بە ڕاسەرماندا هات، ئەوەندە نزم ئەفڕی خەریک بوو بدات لە ملمان، بەڵام بۆردومانی نەکردین، هۆکاری نزم فڕینەکەشی ترسی بوو لەوەی تەقەی لێ بکرێت، کە ڕۆیشت پێشمەرگە تەقەی لێکرد، دانەیەک لەو فڕۆکانە لە چەمێک لە پشتی دەڵەمەڕ پێی دەڵێن سەرکەورگان کەوتەخوارەوە، شوێنێکە جێگەی دووسەد کەس دەبێتەوە.

ئێمەش کە دەرچووین(ئەو خێزانانە بووین کە بەیەکەوە لە هەڵەبجەوە بەڕێکەوتبووین) لە شار تۆزێک ترسمان کەم ببووەوە، وتمان ئەڕۆین بۆ ئێران، چونکە تازە دانیشتن نیە، وتمان با خێرا نزیک ببینەوە. بۆ بانگی بەیانی گەیشتینە گوندی سازان، ڕێگاکە قەرەباڵغ بوو، بەجۆرێک ڕێگە نەبوو بەئاسانی ڕێ ببڕی و دەربچی، لەڕێگادا جگە لە خەڵک پاسداریشمان ئەبینی. لە سازان تراکتۆرەکەمان بەجێهێشت، نەک هەر ئێمە، هەرکەسێک سەیارەی هێنابوو لەوێ بەجێی هێشتبوو، لایەک لە سەیارەی ئەم شارە لەوێ جێهێڵرابوو، دواتر بەپێ ڕێمانکرد، من پورێکی خێزانم دابوو بەکۆڵمدا، لەگەڵ فاروقی برای خێزانمدا بەسەرە هەڵمان ئەگرت، بەیانییەکەی ڕۆژبوویەوە بووین بە دوو تاقم، ئێمە لە پێشەوە بەدەشتی سازاندا بەپێ دەڕۆیشتین بەرەو ئاوی سیروان، وتیان بۆ

کوێ دەڕۆن؟ کیمیایی داوە لەسەر پردەکەی سیروان، ئێمەش دەست و دەممان تەڕکرد و بەرزاییەکی لێبوو چووینە سەر بەرزاییەکە، بۆنی سیر و سێو ئەهات، من خۆم بۆنم ئەکرد، لەبەرئەوەی دووربووین لە شوێنی بۆردومانەکە و بەرزیش بووین کێشەیەکی وای بۆ دروست نەکردین، بەڵام لەسەر بەرزاییەکەوە سەیرمان ئەکرد کیمیایی بەسەر سیروانەوە وەستابوو، وەک دوکەڵ دیار بوو. سەرباری ئەوەش مەترسی ئەوەمان هەبوو ئێمەش بۆردومان بکات، بۆردومانیشی کردین، بەڵام ئێمە بەرنەکەوتین، بۆردومانەکە ناو باخەکانی سازانی گرتەوە، فڕۆکەکان هەوڵی تەقاندنەوەی پردەکەی سیروانیان دەدا بۆئەوەی خەڵک نەپەڕێتەوە بۆ ئێران، بەڵام سەری نەگرت.

ئێمە سەعات نۆی بەیانی گەیشتینە دەشتی سازان، وەک گووتم جەماعەتێکمان لەپێشەوە بووین، دایکم و خەسوم و کۆمەڵێکی دیکەش لەدواوە بوون، فڕۆکەکان بواریان نەئەدا بەیەکەوە بڕۆین، زوو زوو دەهاتنەوە ڕاسەرمان، بەمنداڵەکانم گووت مەترسن دوو دەقەی دیکە فڕۆکە نەیەت ئێمە ئەپەڕینەوە ئەوبەر، ئەوێ ئێرانە و ترسی نییە، بەڵام نیو دەقەی نەبرد لە دوو دەقەکە فڕۆکەکان هاتنەوە و دەستیانکرد بە بۆردومانکردنی دەوروپشتی ئێمە، سێ پاسدار گوێدرێژێکیان پێ بوو بەر بۆردومان کەوتن، لاشەی سێ پاسدار و گوێدرێژەکەی تێکەڵ کرد بەمل یەکدا، تەپۆڵکەیەک گڵیش بەر سەری من کەوت، باش بوو هیچم لێ نەهات، پوری خێزانم کە بە کۆڵی منەوە بوو دامنایە سەر ئەرزەکە، ئەویش لە ترسا ڕاستبۆوە و هەستایە سەر پێ و ڕایکرد.

جگە لە پاسدارەکان، ماڵی عەلی چەتوون و ماڵی یونس عەلی چەتوون بەرکەوتن، هەروەها ماڵی سەباحی کەریم بەگی هەورامی کە خەڵکی خارگێڵان بوون کە لەگەڵ ئێمە بوون لەسەر ئاوی سیروان بەرکەوتن، تەنها سەباح خۆی دەرچوو و ئەوانی دیکەیان شەهید بوون. وادیاربوو ئێمە جێمابووین، چونکە خەڵکێکی زۆر بەر لە ئێمە پەڕیبوونەوە و ڕۆیشتبوون، دایکی خێزانم لەناو تراکتۆرەکەدا ئەیگووت دونیا هەستێ من نایەم. نان و برنجمان پێبوو، وتمان لەو شاخانە ئەمێنینەوە و ئەیخۆین، بەڵام لە دەشتی سازان جێمان هێشت.

کاتێک ئێمە لە پردەکە پەڕینەوە، ژمارەیەکی زۆر پاسدار لەوبەری سیروانەوە بوو، ڕەبییەیەکیان بۆ تەقەکردن لە فڕۆکەی عێراقی دانابوو. هەندێک بۆری گەورەی ئاو کە بۆ دروستکردنی پرد هێنابوونیان لەوێ بوون، کە فڕۆکەکان ئەهاتن ئێمە ئەچووینە ناو بۆرییەکانەوە، لێرەوە ئێمە بووین بە دوو بەشەوە، بەشی پێشەوە کە ئێمە بووین سەیارەیەکی پاسدار لە جۆریی میکزەمینی هات سواریان کردین و گەیاندینیانە مەڕەخێڵ،

مەڕەخێڵ وەک وێستگە وابوو، خەڵکیان لەوێ کۆئەکردەوە، لەوێ ئێمە چاوەڕێمان کرد هەتا جەماعەتەکەی دیکەمان هاتن، لە ڕێگا پاسدار ئەهاتن و ئەیانگووت ئەوە زۆرمان ماوە بگەینە نەجەف و کەربەلا، منیش ئەمگووت چەند کیلۆمەترێکتان ماوە. هەر لە مەڕەخێڵ تیمی تەندرووستی ئێرانی سەرپێیی خەڵکیان ئەبینی، ئەگەر کەسێک پێویستی بە چارەسەری سەرەتایی بووایە چارەسەریان ئەکرد، یان قەترەیان ئەکردە چاوی ئەوانەی کیمیایی کاریگەری لەسەر دانابوون.

لەوکاتەی کە فڕۆکەکان بۆردومانی ئێمەیان کردبوو لەسەر پردەکەی سیروان، دایکم وتبووی بە خەسوم ئەبێ مابن؟ ئەویش وتبووی بەخوا کەسیان نەماون و مردوون. هەرچۆنێک بێت هەموومان لە مەڕەخێڵ گەیشتینەوە بەیەکتر، لە مەڕەخێڵ سەیارەی جۆری گەلابەیان هێنابوو بۆ گواستنەوەی خەڵک، قیری تیابوو، وتم سواری ئەم سەیارانە نابم ئەگەر بشکوژرێم، ئەوەندەی نەبرد پاسێک هات وتم ئەمە خوا بۆ ئێمەی ناردوە، سواربووین بەوشاخانەی لای پاوەدا هەتا گەیشتینە کەنگاوەر، فڕۆکەش لە دوامانەوە بۆردومانی ئەکرد، ئەو فڕۆکانە هەتا بانگی عیشا لە شارەکان و قافڵە و خەڵکی ئەدا. شەو بوو کە گەیشتینە کەنگاوەر، هەتا بەیانی ڕۆژبوویەوە لە مەکتەبێک دایاننابین، مەکتەبەکە پڕبوو لە خەڵک، هەر پۆلێکی ئەو مەکتەبە هەشت عائیلەیان تێ کردبوو، هەر عائیلەیەک یەک بەتانیان پێ ئەدا. ئێمە لە ٣/١٨ چووینە مەکتەبەکەی کەنگاوەر. نزیکەی بیست ڕۆژ لەناو ئەو مەکتەبەدا ماینەوە، لەوماوەیەدا زیاتر خواردنی ئامادەکراویان پێ ئەدایین، زیاتریش پەتاتەی کوڵاو بوو، جار جاریش برنج هەبوو. ئێوارەیەکی ڕەمەزان وتیان ئەوە بانگیدا، وتم با هەر بانگ بدات، خۆ ئێمە تیکەیەک نان لە ماڵماندا نییە خێزان و منداڵەکانم ڕۆژووی پێ بشکێنن، بۆ هەندێک نان هەبوو کە لەگەڵ خۆیاندا بوون، بەڵام ئێمە لەو پیاوانە نەبووین....

سەبارەت بە ئاماری قوربانیانی خێزانەکەی ئێمە، وەک پێشتر باسم کرد باوکی خێزانم بە تۆپی ئێران شەهید بوو، خاڵۆزای خێزانم، پورزای خێزانم، مەعبوبەی خاڵە حسێن پوری خێزانمە لەناو شاردا شەهید بوو، دوو منداڵی کە کوڕێک و کچێک بوون دیار نەمان، تەنانەت لە ئێران بینیبوونیان. کچەکە ناوی شەهلا بوو تەمەنی یانزە ساڵ بوو تەلەبەی پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بوو، کوڕەکەش ناوی ئالان بوو، تەمەنی شەش ساڵ بوو، تازە خرابوویە بەر خوێندن، باوکیان حافظ بوو، خوشکەکانی کیمیایی لێی دابوون و کوێر ببوون، ئەو دوو منداڵە کیمیایی لێی نەدابوون لەگەڵ خۆیان بردبوونیان بۆ ئێران، لە نەخۆشخانە لێیان وەرگرتبوون، کەس نەیزانی چیان لێ بەسەرهات، زۆریش

گەڕان بەشوێنیاندا تا ئێستاش نەدۆزراونەتەوە.

پورزایەکیشم بەناوی محەمەد ڕەحیم کە دوو سێ ڕۆژی لە عەبابەیلێ مابوویەوە و دواتر هاتبوو بۆ ئێران، کیمیاییەکە کاریگەری لەسەر دانابوو، تووشی تەنگە نەفەسی کردبوو، لە گەلیاران کۆچی دوایی کرد، خالۆ حاجی فەرەج کە خەزووری عەبدوڵڵای برامە ئەویش کیمیایی لێی دابوو لە تاران بەتەئسیری کیمیایی کۆچی دوایی کرد و هێنایانەوە لە کامیاران بەخاکیان سپارد.

پێشتر گووتم ئێمە لە سازان بووین بەدوو بەشەوە،ماڵی کاک سەڵاحی زاوای کاک نووریی و ئەوان ڕۆیشتبوون بۆ کرمان، دوو منداڵی منیش بەناوەکانی سەروەت و سۆزە لەگەڵ ماڵی خاڵیان ڕۆیشتبوون، چونکە لەوکاتەدا خەسوم ئەیگووت نایەم تا قەناعەتم پێکرد ئەوان ڕۆیشتبوون بۆ هەرسین، ئێمەش چووینە کەنگاوەر، هەموو ڕۆژێک دەهاتن ناویان دەخوێندەوە کێ عائیلەکەی تەواوە بینێرن بۆ کرمان و کێش منداڵی ونبووە ناوی بنووسن، ڕۆژانەش منداڵیان دەگێڕا بە ئەو شوێنانەی کە ئاوارەکانی هەڵەبجەی لێ بوو دەیانگووت ئەمە منداڵی کێیە؟ وەرەقەیەکیان بۆ من کرد وتیان بڕۆ بگەڕێ بەدوای منداڵەکانتدا، چووم بۆ هەرسین لەوێ دۆزیمنەوە و هەردووکیانم هێنایەوە، ڕۆژێکی تر هاتنەوە ئێمە تەواوبووین، کە ناوەکانیان خوێندەوە زاتم نەبوو بڵێم ئێمە تەواوین.

حاجی حەسەنی برام و مامۆستا عەلی لە ساڵی ١٩٨٧ ڕۆیشتبوون بۆ ئێران، ڕۆژێک حاجی حەسەنی برام پاسێکی هێنا و وەرەقەی کرد بۆ ماڵی ئێمە و خەسوم لە کەنگاوەرەوە ئێمەی برد بۆ ئۆردووگای شەهرەک لە کامیاران، لەوێ خێمەیان داینێ و هەڵماندا، هەرچەندە ماڵی حاجی حەسەنی برام خانوویان هەبوو وتیان وەرنە لای ئێمە و لێرە بمێننەوە، بەڵام ئێمە نەچووین، ئەوان حیزبایەتیان ئەکرد و منیش لە ژیانمدا تاقەتی ئەو شتانەم نەبووە، خێمەمان هەڵدا لەناو ئەو خەڵکەدا و نیشتەجێ بووین، مزگەوتەکەشمان هەر خێمە بوو.

**پرسیار/ لەکاتی کیمیاییباراندا، لە دانیشتووانی گوندی عەبابەیلێ کەس شەید بووە؟**

وەڵام/ ئەوانەی کە لە عەبابەیلێ بوون کەسێکی وایان لێ نەبوو بە قوربانی، بەڵام ژمارەیەکیان لەناو شاری هەڵەبجە بەرکەوتن و بەوهۆیەوە شەهید و بریندار بوون. هۆکارەکەشی ئەوەبوو فڕۆکەکان کیمیابارانی عەبابەیلێیان نەکرد، خەڵک هەبووە دوو شەو دوای کیمیاییەکە لەوێ ماوەتەوە، لەبەرئەوە بۆردومانەکە زۆر کاریگەری لەسەر عەبابەیلێ نەبوو، ماڵی حاجی ڕەسوڵی برام لە پشتی دەڵەمەڕەوە لە شوێنێکدا بوون سەرکەورگانی پێ دەڵێن، چوار ڕۆژ لە ئەشکەوتێکدا مابوونەوە، ئێمە دوای پانزە ڕۆژ

ئەنجا هەواڵی ئەوانمان زانی.

بەکورتی، لە عەبابەیلێ بەهۆی بۆردومانی کیمیایی کەس نەبووە قوربانی. ئەگەر ئەو فرۆکانەش هەموویان بۆردومانی خەڵکیان بکردایە کەس نەئەمایەوە، بەچاوی خۆم هەندێکیانم ئەبینی ئەڕۆیشتن لە ملەی سازان و حەمەوغان کیمیاییەکەیان بەتاڵ ئەکردەوە و ئەڕۆیشتنەوە، یان لە پشتی گوندی بامۆکەوە کە سەرەکەوی بۆ شاخەکە شوێنی ناپاڵمەکانیان دیاربوو کە لەوێ خاڵییان ئەکردەوە، فڕۆکەوانەکان هەموویان جەلاد نەبوون، کەسی باشیشیان تیابوو.

پرسیار/ لە دوای کیمیاباران لە عەبابەیلێ، خەڵکێک هەبوو لە عەبابەیلێ مابێتەوە و نەچووبێ بۆ ئێران؟

وەڵام/ بەڵێ ئەوەی من بزانم پیاوێک بەناوی تۆفیق فەرەج لەگەڵ خێزانەکەی بەناوی سەلما عابید هەر نەهاتن و لەوێ مابوونەوە، هەندێک حەیوانیان هەبوو، هەروەها کاک سەید ڕەحمان هەبوو کەمێک ناتەواو بوو لەگەڵ دایکی مابوونەوە، ئەم چوارە لە عەبابەیلێ مابوونەوە و نەچووبوون بەهیچ لایەکدا تا جەیشی عێراقی هاتەوە، هەندێک خەڵکی هاواریش لە هەڵەبجە مابوونەوە، ڕۆژێک تەیارەیەک هاتبوو لە عەبابەیلێ هەڵیگرتبوون و بردبوونی بۆ کەرکوک، ماوەیەک لە سجنی کەرکوک بوون پاشان ئازادیان کردبوون و گەڕاندبوونیانەوە بۆ سلێمانی.

**پرسیار/ چوونە دەرەوە لە ئۆردووگا چۆن بوو؟**

وەڵام/ ئۆردووگاکە زۆر قەرەباڵغ بوو، لە سەرەتاشەوە چوونە دەرەوە بە ڕۆژ بوو، ڕۆژ هەبوو زۆر خراپ بوون و ڕۆژیش هەبوو ڕێگریان لە کەس نەدەکرد. بەڵام دواتر چوونە دەرەوە بۆ هەموو کەسێک ئازاد بوو، ئەگەر پێویستیمان بە شتێک هەبووایە دەچووینە دەرەوە بۆ کڕینی، زیاتریش بۆ کامیاران بوو، چونکە نزیک بوو لە ئۆردووگاکەمانەوە. ئێمە ئەو بڕە پارەی کە لەگەڵ خۆماندا بردبوومان پێمان بوو، حاجی حسێنی براشم بڕێک پارەی بۆ گۆڕیبووینەوە، لە خوا بەزیاد بێت ئەو کاتە وەزعمان باش بوو، سەد (٢٥)ی ئەوکاتەی سەدامم لە باخەڵدا هەڵگرتبوو، ماڵی کاک نووری دوو سەیارە و تراکتۆرەکەیان جێهێشتبوو و یەک دیناریشیان لەگەڵ خۆیان نەبردبوو، پارەکانیان لە ماڵ جێهێشتبوو، بەڵام ئێمە تەسکەرە و پارەمان هەڵگرت ئەنجا ماڵمان جێهێشت، لە ئێران پارەم دابەشکرد کرد بەسەر هەموویاندا، هەتا لەتیفی کوڕی کاک نووری وتی کاک مستەفا تۆ ئەم پارەیە ئەدەیت بە ئێمە لەوانەیە نەگەینەوە ماڵ، وتم گەردنتان ئازاد بێت، هەرچی ناسراو بوو پارەم پێدا.

**پرسیار/ ئێوە چۆن ئاگاداری لێبوردنەکەی عێراق بوون؟**

وەڵام/ ئێوارەیەک لای مزگەوتەکەی ناو ئۆردووگا وەستابووین، وتیان سەدام حسێن لێبوردنی دەرکردووە، خەڵک باوەڕی پێی نەبوو، بەهۆی بوونی ژمارەیەکی زۆر لە ڕادیۆ لەو ناوەدا من هەر ئەو ئێوارەیە گوێم لە لێبوردنەکە بوو، ماڵی حاجی حسێن ئەوکات تەلەفزیۆنیان هەبوو، دەستیشی ئەڕۆیشت لەناو بزووتنەوەدا، خەڵک گاڵتەیان لێ دەهات ئەیانگووت ئەبێ خەڵک هەبێ بڕواتەوە؟ منیش وتم ئەڕۆمەوە، وتیان چۆن ئەڕۆیتەوە؟ وتم پێنج برا و دایک و خوشک و ئەم منداڵانە هەمووی ئەخەمە شەتوڵعەرەب، بەڵام هەر ئەڕۆمەوە. من زۆر بێزاربووم، ئێستاش ئەوەندە بێزارم هەوا لە ئێرانەوە بێت هەڵی نامژم، جارێک چاوم ئازاری هەبوو وتیان بە فڕۆکە ئەتبەین بۆ تاران بۆ عەمەلیات، وتم بمبەن لە فڕۆکەکە خۆم فڕێ ئەدەمە خوارەوە.

بەکورتی، ئێمە نزیکەی شەش مانگێک لە ئێران ماینەوە، لە ١٧-٩ لۆریان پێدام و لە ١٨-٩ گەڕاینەوە بۆ تەوێڵە. ئەوانەی کە گەڕاینەوە بریتی بووین لە ماڵی ئێمە، ماڵی مامەم حاجی باقی خەزووری حاجی حەسەنی برام، ماڵی کوڕێکی خزممان و ماڵی عەلی سەعید مەیکە کە خەڵکی گوندی جێڵە(جەلیلە) بوون، ئەم چوار ماڵە پێکەوە بە لۆرییەک کە سایەقەکەی ناوی عومەر محەمەد حەسەن بوو هاتینەوە. هاتنەوەکەش چۆن بوو؟ ئێرانییەکان وەرەقەیان بۆ دەکردی ئەیانگووت بڕۆن سەیارە بێنن و سەرکەون و بڕۆنەوە بۆ عێراق، بەڕێکەوتین شەو گەیشتینەوە سنوری خۆمان، مەنتیقەی شوشمێ، ئەوەندە خەڵک و لۆری وەستابوو ڕێگە نەبوو بگەینە سەر سنوور، لەناو گوندی شۆشمێ دوو شەو ماینەوە، واتە ئەو سەیارە ئێرانییەی پێی هاتین دوو شەو لە سەر سنوور لەگەڵمان مایەوە تاوەکو زیلەکە نەهات ئێمە عەشیاکانمان خاڵی نەکرد لە لۆریەکەدا جێی نەهێشتین. ڕۆژێکیان من هاتم بۆ سەر مەرزەکە ئامرێکی عێراقی معەسکەری ئەو مەنتیقە هات بۆ ئەوێ لەگەڵ پارێزگاری کرماشان، وتیان کێ عەرەبی ئەزانێ؟ وتم من عەرەبی ئەزانم، پارێزگارەکەی کرماشان وتی قسەکانم بۆ ئامرەکە تەرجومە بکە، بڵێ ئەم شەو تا بەیانی یەک ماڵ لەم سنوورە بمێنێتەوە دەیگەڕێنمەوە بۆ کرماشان، ئامرەکە وتی باشە، بانگی عیشا زیل هات، من بە منداڵەکانم گووت ئێمە کۆتا کەسین کە سەرەمان دێت تا بەیانی بۆ خۆتان بخەون، ئەو شەوە لێی خەوتین، بەیانی زوو سەرەمان هات، سەعات هەشتی سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٩٨٨/٩/١٨ گەیشتینە تەوێڵە.

لە سنوور جەماعەتێکی ئێرانی و عێراقی تێکەڵ هەبوون، دوو سێ پرسیاریان لە سایەقەکان ئەکرد، ئێمە مامەم لە پێشمانەوە بوو، هەندێک پرسیاریان لێکرد و دواتر

وتیان بڕۆن، کاتێک لۆریی و زیلەکە دوایاننا بەیەکەوە عەسکەری لێ نەبوو تەنها سایەق زیلەکە و لیژنەیەکی لێ بوو لەسەر سنوور، عێراقییەکان نەک هەر سوکایەتیان پێ نەکردین، بەڵکو زۆریشیان پێ خۆشبوو کە گەڕاینەوە. هەرچی ئەوراقێکیش کە هەبوو ئەدرا بە سایەقەکە، ئەویش ئەو ئەوراقانەی تەسلیمی لیژنەکە ئەکرد.

ئێمە ئەوکاتە ئەمانزانی هەڵەبجە بووە بە ناوچەیەکی محەڕەمە و لە سەدا سەد نامانبەنەوە بۆ ئەوێ، چونکە پێشتر خەڵک هاتوچۆی ئەم دیویان کردبوو، ئەیانزانی مقەڕی گەورەی عەسکەری لە گوندی حەسەن ئاوا هەیە، دوای ئەوەی ئێران پاشەکشەی کرد عەسکەرییە لە حەسەن ئاوا هەڵیان دابوو. هەرچۆنێک بێت ئێمە هاتینە گوندی بەڵخە، لەوێ سەیتەرەیەکیان دانابوو خواردنیان ئەدا بە خەڵک، عەلاگەیەک خواردن بوو، زیاتر بسکیت بوو بۆ ئەو چوار ماڵەی لە زیلەکەدا بووین. کە گەیشتینە سەیدسادق، چۆڵ بوو کەسی تیا نەبوو، دواتر گەیشتینە عەربەت، لە منەزەمەکەی عەربەتیش هەندێ خورادنیان دەدا بە خەڵک. دوای ماوەیەک وتیان تۆ عەسکەری یان فیراری؟ وتم فیرارم، لەوکاتەدا ئەوەی عەسکەری فیرار بوایە جیایان ئەکردەوە، منیان جیاکردەوە لە جەماعەتی خۆمان، کە چووم نزیکەی بیست کەس ئەبووین، بەوشەوە لەکاتی بانگی عیشادا پاسێکیان بۆ هێناین و بردینیان بۆ معەسکەر سەلام. ئیتر نەمزانی عائیلەکەم بۆ کوێ ئەبەن. ئەوانەی لەنێو ئەو پاسەدابوون زۆربەیانم ئەناسی، لەوانە عەلی سەعە مەیکە، هەروەها کەسێکی دیکەش بەناوی کاک مەحمود کە خەڵکی عەبابەیلێی بوو.

با ئەوەش بڵێم لە عەربەت هیچ سوکایەتییەکیان پێ نەکردین، چونکە لێبوردن بوو، بەڵام هەرکەسێک پارەی تمەنی ئێرانی پێبوایە لێیان وەرئەگرت. لە معەسکەر سەلام کتابێکیان بۆ ئەم بیست کەسە کرد، دەبوو هەرکەسێک بچێت بۆ ئەو شوێنەی لە کتابەکەدا بۆی دیاری کرابوو، کە هاتینە دەرەوە، وتم با ئەم کتابە ئیستینساخ بکەین، چونکە من ناگەڕێمەوە بۆ عەسکەریی و ئەڕۆمەوە بۆ ماڵی خۆمان، ئێوەش هەرکەسە و با نوسخەی خۆی پێ بێت، بەیانی ئەڕۆن یان سێ ڕۆژی دیکە ئارەزووی خۆتانە، چونکە هەرکەس بۆ شوێنێک بوو، یەکێک بۆ عەمارە، یەکێک بۆ کەرکوک، یەکێک بۆ فایدە و یەکێک بۆ موسڵ بوو، بەوشێوەیە دابەشیان کردبووین.

ئێمە عەسر گەیشتینە ناو عەربەت بۆ بانگی مەغریبیش گەیشتینە معەسکەر سەلام، حاجی باقی مامەم لەگەڵ ماڵەوەمان لە عەربەت بەجێما بوو، خێزانی مامەشم لە سلێمانی بوو، مامەم حەمە قتووی گۆرانی بێژیی ئەناسی، لە عەربەت ئەوی دۆزیبوویەوە و چاوی پێی کەوتبوو، پێی وتبوو بڕۆ بە عارفی حاجی فەرەج کە ژنبرای بوو بڵێ حاجی

باقی هاتووەتەوە و ئەیانبەن بۆ باینجان، بەوشێوەیە حاجی باقیان دۆزییەوە و جیایان کردبوویەوە و بردبوویان بۆ سلێمانی بۆ ماڵی خۆیان.

ئێمە لە معەسکەر سەلام هاتینە دەرەوە و کتابەکانمان ئیسینساخ کرد، من چووم بۆ سلێمانی بۆ ماڵی حاجی باقی مامەم، ئەو شەوە لەوێ بووم، مامەشم هاتبوویەوە و کەلوپەلەکەشی لەگەڵ کەلوپەلەکانی ئێمە لە سەیارەکەدا بوو، بردبوویان بۆ باینجان، نوسخەی کیتابە عەسکەرییەکە لە باخەڵمدا بوو، وتم جارێ نەڕۆم تا چارەیەک بۆ منداڵەکانم نەدۆزمەوە، مامەم کەسێکی بەناوی کاک خەسرەو ئەناسی، پێنج بۆ شەش لۆری هەبوو، بایەعی حکومی مەنتیقەکانی هەڵەبجە و دەوروبەری ئەو دابەشی ئەکرد، مامەم هەواڵی نارد بۆ کاک خەسرەو وتی بەڵکو لۆرییەک پەیدا بکەی بۆ مستەفای برازام با ئەو منداڵانەی لە باینجان بهێنێتەوە، کاک خەسرەویش هەواڵی نارد بۆ من، وتی مستەفا برۆ کاک فایەقی شۆفێر شەکر بارئەکات، ئەگەر بارەکەشی بارکردبوو پێی دابگرەوە و برۆ لەگەڵیدا منداڵەکانت بهێنەرەوە، کاتێک ڕۆیشتم کاک فایەق هێشتا سێ فەردە شەکری بارکردبوو، من کاک فایەقم بەبۆنەی کاک خەسرەووەوە ئەناسی، چونکە سایەقی ئەو بوو، وتم کاک فایەق فەردە شەکرەکانت دابگرەوە، وتی خێرە؟ وتم منداڵەکانم و کەلوپەلەکەی حاجی باقی لە باینجانن، بابرۆین بیانهێنینەوە، وتی جا برۆین و لە سەیتەرەکەوە بێینەوە هەمووومان ئیعدام دەکەن، چونکە مەمنوع بوو خەڵک بێتەوە، هەرکەسێکیان بگرتایە ئەیانبرد، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە سەیتەرەکەی تاسلۆجە، زابتێک هات بە کاک فایەقی سایەقی لۆرییەکەی گووت ئیجازەکەت، وتی سەیدی ئێمە مەسڵەحەی بایەعاتین، خواردن تەوزیع دەکەین، زابتەکە وتی ئەم شتانە ناخوات ئیجازەکەتم بدەرێ، وتی سەعات یانزدە ئەڕۆی لە مروری سلێمانی جوندی بار دەکەیت بۆ موسڵ، هەرچیمان کرد لەگەڵ زابتەکە نەیخوارد، سەعات هەشتی بەیانی ڕۆیشتین ماڵ و منداڵم دۆزییەوە، پاسەوانەکان لە دەرەوەی ئۆردووگاکە بوون لای ڕێگاکە، بۆیە پێیان نەزانین. تەماشا ئەکەم مناڵەکان بە چیلکە و درک و داڵ خەریکی سێبەر دروست کردنن، وتم هیچ مەکەن کەلوپەلەکان خێرا بهێنن و باری بکەن، لەگەڵ منداڵەکان هەموویانمان خستە ناو سەیارەکە، پاشان کەوتینەڕێ، هەتا گەیشتینە سەیتەرەکەی تاسلۆجە کەس نەیگووت بۆ کوێ ئەڕۆن، کە گەیشتینە تاسلۆجە، وتم کاک فایەق تۆ هیچ مەڵێ، خۆم قسە لەگەڵ ئەو زابتە ئەکەم، سەرم دەرهێنا تا گەیشتینە لای زابتەکە، وتم سەیدی ئێستا برۆین جوندییەکان باربکەین، وتی برۆن، بەو کەلیمە خۆمان نەجاتدا، منداڵەکان پاڵ کەوتبوون، دووسێ پەڕۆ و شت با بردبووی، منداڵەکان زاتیان نەبوو سەر بەرز بکەنەوە و نەهێڵن شتەکان بابیبات،

بەوشێوەیە نەجاتمان بوو. چووین بۆ سلێمانی بۆ ماڵی حاجی باقی مامەم، تا حاجی باقی مامەم لە ئێران گەڕابوویەوە ژنەکەی خانوویەکی کرێ بوو، لەوێ ماینەوە...

دوای ئەمانە، وتم من ئەڕۆمەوە بۆ عەسکەری، بڕیاربوو بڕۆم بۆ فایدە کە لای موسڵە، پێشتر عەسکەریم لێ کردبوو، نزیکی مەغریب گەیشتمە موسڵ، لە چایخانەیەک دانیشتبووم، وتم ئەم شەو لە موسڵ ئەبم و بەیانی ئەڕۆم بۆ فایدە، لە چایخانەکەدا عەسکەرێک لەوبەرمەوە بوو سەیری ئەکردم، وەک بڵێی ئەیناسیم، نائیب عەریفێک بوو، دوو خەتی هەبوو، وتم برای باوکم بە عەرەبی قسە ناکەم، چونکە ئەزانم تۆ کوردی، هەتا ئێرە وەرە، جلی کوردیشم لەبەردابوو، هات و سڵاومان لەیەکتری کرد، وتم تۆش کوردی، وتی بەڵێ، وتم خەڵکی کوێیت؟ وتی هەڵەبجە، وتم عەبابەیلێیی نیت؟ وتی بەڵێ خەڵکی عەبابەیلێم، وتم کوڕی قالەی مەلا حەسەن نیت؟ وتی با کوڕی ئەوم، ناوی ڕەفعەت بوو، عەسکەر بوو هەر  کە منی بینی لە خۆشیدا حاڵی نەبوو، باوکی لە معەسکەرەکەی گردەچاڵ مردبوو ئەم نەیزانیبوو، وتم منیش مستەفا ڕەشیدم و خەڵکی عەبابەیلێم، ئێمە خزمین، دڵخۆشی زۆرم دایەوە، ئەو لەکاتی کیمیاییەکەدا لەوێ نەبوو، عەسکەر بوو، وتی هەواڵی ماڵی باوکم ئەزانی؟ وتم بەڵێ، وتی لەکوێن؟ وتم لە شوێنێکن پێی ئەڵێن گردەچاڵ، وتی گردەچاڵ چیە؟ وتم ئۆردووگای هەڵەبجەییەکانە، کەسیان نەبردووەتەوە بۆ هەڵەبجە، هەموو ئەو خەڵکانەی لە ئێران گەڕاونەتەوە بردوونیان بۆ ئەوێ، وتم ئەڕۆی بۆ لایان؟ وتی بەڵێ، من دەمزانی باوکی مردووە و خۆشم چووبووم بۆ پرسەکەی باوکی، ڕەفعەت پورزای دایکی خێزانم بوو، وتم جومعە و شەممە بڕۆ بۆ هەولێر و پرسیاری نقلیاتی گردەچاڵ بکە نیشانت ئەدەن، سواری پاس ببە و بڕۆ بۆ ئەوێ، بە مکەبەرەیەک بڵێ من ڕەفعەتی مەلا حەسەنم، بێن بەدەممەوە.

ئەو شەوە لە ئوتێلێکی موسڵ مامەوە، بەیانییەکەی ڕۆیشتم بۆ فایدە، ڕەفعەتیش ڕۆیشتبوو ماڵەوەیانی دۆزیبوویەوە، وەک گووتم پێشتر لە فایدە عەسکەریم زۆرم کردبوو، لە ساڵی ١٩٨١ بە عەسکەری لە نەوسوود بووین، زابتێکمان هەبوو پێکرا، پارچە تۆپی بەرکەوتبوو، پەنجا پارچە ئەبوو بەریکەوتبوو، ئێمەش پاسەوانی بووین، کە چووینە سەری هاواری ئەکرد، منیش هەرچەند هاوارم ئەکرد دکتۆر دکتۆر، لەترسی تۆپی دیکە کەس زاتی نەبوو بێتە دەرەوە، دکتۆر نەیئەوێرا بێتە دەرەوە، منیش زابتەکەمدا بەشانمدا و بردم بۆ ژووری دکتۆرەکە، ئەو ڕۆژە هەر ئەو تۆپە هات، ئەویش خەتای خۆمان بوو ئاوای بەسەرهێناین، ئەو ڕۆژە یارمەتی دوو سێ ئێرانیماندا بڕۆن، ئێرانییەکان چووبوون ئیخباریان کردبووین، وتبوویان زابت و عەسکەرەکان لەو شوێنەدان، من عەرەبی باشم

ئەزانی لە عەسکەریدا، بۆیە هەمیشە لەگەڵ زابتەکاندا بووم، چالاکیم هەبوو، هەشت ساڵ عەسکەریم کردووە، وام ئەزانی هەشت ڕۆژە، قەد گوێم نەئەدایە.

هەر بەو تۆپەی ئێران عەسکەرێکی تری عەرەب بەناوی ڕائید بەرکەوت و هەناسەی نەدا و مرد، زابتەکە کە پەنجا پارچە بەر سنگ و سکی کەوتبوو نەمرد، یەکێکی دیکە هاواری ئەکرد چووم بەدەمییەوە قاچی بە پۆستاڵەکەیەوە لە خوار ئەژنۆیەوە نەمابوو، زابتەکە وتی هەرسێکمان بخەنە ئیسعافێک و بمانبەن، لە سەیدسادقیش نەوەستن، شەش بۆ حەوت حیمایە لەگەڵیان ڕۆیشتین، بۆ بانگی عیشا بردماننە نەخۆشخانەی عەسکەرییەی سلێمانی، لەوێ زابتەکە وتی کە گەڕانەوە لە سەیدسادق لانەدەن، وتمان باشە سەیدی، بەو شەوە هاتینەوە نەوسوود، ئەو ڕۆژانە ڕێگاکە زۆر مەترسیدار بوو، شارەزوور پێشمەرگەی تیابوو.

بگەڕێمەوە بۆ باسەکەی خۆم، بەیانی چوومە فایدە، لای عەسر کۆمەڵێکی دیکە هاتن و کۆبووینەوە، لەوانە مامۆستا حەسەن شەمێرانی و ئەسکدەنەری حەمەی هەواس و سیروانی عەبەی عەلی و خۆم، ئەم چوارە کۆبوینەوە و بووین بە ڕەفیق، هەریەکەمان بەتانییەکیان پێداین، لای بەتانییەکە عەریفێکی لێبوو چووم بۆ بینینی، وتم عەریف، زابتێکی عەرەب هەبوو کاتی خۆی خەڵکی ئەم مەنتیقەیە بوو، وتی ناوی چیە؟ وتم حەمید خەلیفە محەمەد، وتی چۆن ئەیناسی؟ وتم ماوەیەک موساعیدی ئامر فەوجی ئێمەبوو لای تەلەعفەر، بەیەکیشەوە بووین کە بریندار بوو، وتی بەڵێ ماوە ئامری ئەو مەرکەزەیە لەوێدا، بەتانییەکەمدا بە مامۆستا حەسەم شەمێرانی، وتم با هەواڵێکی ئەو پیاوە بزانم، لەو شوێنەی خۆمانەوە زۆر دوور نەبوو، ڕۆیشتم زابتێک لە سەیتەرەکەدا بوو، بۆئەوەی بڕۆمە ژورەوە وتم موقەدەم حەمید لێرەیە؟ وتی چیت ئەوێ لێی؟ وتم خزممە، هەتا ئەوکاتەش من جلی کوردیم لەبەردابوو، چونکە هێشتا جلیان پێ نەدابووین، وتی تۆ کورد و ئەو عەرەب و خەڵکی بەعاج!!

وتم ئەگەر ڕێگەم نادەی ببینم تەلەفۆنی بۆ ئەکەم، وتی بڕۆم بۆلای بلێم چی؟ وتم بلێ مستەفا ڕەشید هەڵەبجەیی هاتووە بۆ لات، سەیرم کرد قەڵەو ببوو، دوو نەقیب لە ژورەوە میوانی بوون، کە حەرەسەکە ناوی منی پێگووت هاتەدەرەوە و باوەشی پێداکردم، بەری نەئەدام، لەو دوو نەقیبە گەورەتر بوو، وتیان سەیدی ئەمە چیتە ئەوەندە برادەرن پێکەوە؟ وتی من مردبووم خوا و ئەم پیاوە منیان ڕزگار کرد. دواتر بردمیانە ژوور بۆ لای خۆیان، چا و ماستاو و کاڵەکیان بۆ هێنام، وتی دەنگوباسی هەڵەبجە؟ منیش زۆر بە حوڕڕی قسەم ئەکرد، وتم جا ئێوە هەڵەبجەتان هێشت؟ وتی بۆ؟ وتم ئەی

ئێوە کیمیاییتان پێدا نەکرد؟ وتی جا ئێمە بووین یان ئێران؟ وتم ئێوە بوون، وتی ئەی کەستان ڕۆیشت؟ وتم نیوەی خەڵکمان ڕۆیشت؟ وتی ئەی عائیلەکەت؟ وتم هاتینە لای عەربەتی خۆم و خۆت جا ئەو دائیم لەوێ بوو، لەوێ ئەگەیشتینەوە بەیەک و چاومان بەیەکتر ئەکەوت بۆ ئیجازە، وتم لەوێ منیان لە عائیلەکەم جیاکردەوە، ئێستا نازانم منداڵەکانم لە کوێن و ونبوون، وتی نقڵیات کردووی بۆ لای خۆم یان بۆ مەدرەسەی زوبا سەخڵە، وتم لای تۆ نیم و لەوێم، وتی ئێستا تەلەفۆن ئەکەم بۆ ئامرەکەت ئیجازەت بۆ بکات، تۆش بڕۆ منداڵەکانت بدۆزەرەوە دواتر وەرەوە بۆ ئێرە.

ئەم مقەدەم حەمیدە پلەی لە ئامرەکەی ئێمە بەرزتر بوو، تەلەفۆنی کرد، وتی عەبدولڕەحمان، وتی بەڵێ سەیدی، وتی جوندییەک خەڵکی هەڵەبجەیە، عائیلەکەی ونبووە، ئەینێرم بۆ لات ئیجازەی بۆ بکە با بڕوات منداڵەکانی بدۆزێتەوە و پاشان بێتەوە، ڕۆیشتمەوە بۆ لای حەسەن شەمێرانی و کاک ئەسکەندەر و ئەوان، وتیان چی بوو؟ وتم وەڵا دۆزیمەوە لەوێ بوو، زۆریش خۆشحاڵ بوو، ئینزیباتێک وتی مستەفا ڕەشید، وتم بەڵێ، وتی وەرە ئامر بانگت ئەکات، چووم منیان برد بۆ مقەڕی فەوجەکە نائیب زابتێکی لێبوو وتی ئەوە چوار ڕۆژ ئیجازەیان بۆ کردووی، وتم نامەوێ، وتی چۆن ناتەوێ؟ ئامر کردوویەتی، وتم خۆ من داوای ئیجازەم نەکردووە، وتم چوار ڕۆژ چی لێ بکەم، بڕۆ پێی بڵێ ئیجازەی بۆ چوار ڕۆژ ناوێ، وتم من مناڵم ونبووە، وتی وەڵا خەوتووە، وتم هەرکاتێک لە خەو هەستا ئیجازەکەی بۆ بەرەوە و من ئەڕۆمەوە بۆ سریە، بوو بە بانگی مەغریب یەکێک بانگی کرد مستەفا ڕەشید، وتم بەڵێ، وتی وەرە بانگت ئەکەن، چووم سەیرم کرد ئیجازەکەیان بۆ کردووم بە هەشت ڕۆژ، وتم ئێستا ئەمەوێ، وتم کاک حەسەن ئەوە بەتانییەکەمە با لات بێت، من بەیانی ئەڕۆم، بەیانی چوومە موسڵ، شەوەکەی لە موسڵ مامەوە و خەوتم، بەیانی گەڕامەوە بۆ ماڵی مامم لە سلێمانی، دوای هەشت ڕۆژ مانەوە لە ماڵەوە، ڕۆیشتمەوە بۆ عەسکەری، چوار ڕۆژیی دیکەی بۆ کردم بە ئیجازە، وتی شتێکت پێ دەڵێم، بەڵام بە هاوڕێکانت نەڵێیت، وتی قەرارتان بۆ دەرچووە سێ بۆ چوار ڕۆژی دیکە تەسریحات ئەکەن، وتی ئەگەر ئەمە نەبوایە نەقڵم ئەکردی بۆ لای خۆم، ئیجازەکەی بۆ کردم، تا هاتمەوە سەیر ئەکەم تەسریح دەرچووە، ناسرابوو بە بڕیاری (٣٦ و ٣٧) یانی گڵاو، بەپێی ئەم بڕیارە دەمانتوانی بێینەوە، بەڵام لە دائیرەکان وەریان نەئەگرتین.

ئیتر ئێمە هەتا ئینتیفازەی ساڵی ١٩٩١ لە سلێمانی ماینەوە، چوار بۆ پێنج مانگ لە ماڵی مامم بووین، دوای ئەوە چووینە خانوویەکی دراوسێی ماڵی مامم، دیواریان

بەیەکەوە بوو، ماوەیەکیش لەوێ کرێچی بووین، ئەو خانووەمان مانگی بە شەست دینار بە کرێ گرتبوو. خانووەکە لە گەڕەکی بەرانان بوو، دراوسێی ماڵی محافز بووین، ماڵە کۆمەڵە و دیموکراتەکان لەپاڵماندا بوون.

ئێمە هەر ماڵی خۆمان بە تەنها بووین، خەڵک هەبوو ئەچوو لەبەر مزگەوتی گەورەی سلێمانی ئەوەستا و کراسێکی سپی لەبەر ئەکرد و ئیشیان نەئەکرد، دینارێکیشیان لە گیرفاندا نەبوو، منیش یاشماخێکم کردبووە ملم و ئەو کاک خەسرەوەی لۆرییەکەی هەبوو وتی برۆ لەگەڵ کرێکارەکان ئیش بکە، ڕۆژ هەبوو شەست دیناری خانووەکەم پەیدا ئەکرد، بایەعیمان لەناو شاری سلێمانی دابەش ئەکرد.

**پرسیار/ دوای ناردنی هەڵەبجەییەکان بۆ گردەچاڵ و بەرحوشتر ئەمن و ئیستخبارات بەردەوام ئەگەڕان بەدوای خەڵکی هەڵەبجەدا بۆئەوەی ئەوانیش بنێرن بۆ ئەوێ، ئێوە ترستان نەبوو؟**

وەڵام/ لە سەرەتادا ترسمان هەبوو کە بمانگرن، چونکە دامودەزگا ئەمنییەکان بەدوای ماڵە هەڵەبجەییەکاندا ئەگەڕان و ئەیانگرتن، بەڵام بە ئێمەیان نەزانی کە هەڵەبجەیین، بۆیە نەگیراین. ئێمە شوێنەکەمان خراپ نەبوو نزیکی ماڵی موحافیز بوو، خۆشم دەفتەر خیدمەیەکم هەبوو، دوو پەڕەم لێ دەرهێنا ساف بوو، پەیوەندیم بە هیچ شتێکەوە نەبوو، دوو پەڕەکەم هەڵگرت تا وەزع باش بوو، کەس لێ پرسینەوەی لێ نەکردم، دوو سێ جار لە بازاڕ داوای تەسکەرەیان لێ کردم، لەبەرئەوەی دەفتەر خزمەتەکەم پێ بوو زۆر کێشەم نەبوو.

ئا: بارام سوبحی

# تۆمارێک لە خوێن

## مێژووی کۆمەڵکوژکردنی مسوڵمانان لەلایەن ڕووسیاوە

**پێشەکی:**

ڕووسیا لە سەردەمی تزار (قەیسەر)ەکانەوە هەتا دەگات بە سەردەمی کۆمۆنیستەکان و ئێستاش، یەکێکە لەو دەوڵەتانەی مێژوویەکی خوێناوی بەرامبەر مسوڵمان تۆمارکردووە، هەر لە قڕکردن و ڕاگواستنەوە تا دەگات بە ئەشکەنجەدان و دەستبەسەراگرتنی سامان و سوتاندنی قورئانی پیرۆز و مزگەوتەکانیان. لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ڕووسیای تزاریی و پاشان کۆمۆنیزم دەستیان بەسەر وڵاتانی مسوڵمانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز و ناوچەی دەریای ڕەش و کریمیادا گرت، جگەلەوەی هاوبەش و شایەتحاڵی ڕێککەوتنامەی «سایکس پیکۆ» بوون، بۆ دابەشکردنی عێراق و شام و وڵاتانی باشووری ئەنادۆڵ لە سەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە ساڵانی (١٩١٥-١٩١٦).

تائێستا هیچ لێکۆڵینەوە و ئامارێکی بەڵگەدار لەسەر قوربانیانی ڕووس و کۆمۆنیستەکان نییە، بەڵام ڕاپۆرتە مێژووییە جۆراوجۆرەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ژمارەکە لە دەیان ملیۆن تێدەپەڕێت، بەگوێرەی کتێبی پرۆفیسۆر ڕۆمێل، «مردن لەلایەن حکومەت»، بەهۆی جینۆسایدی کۆمۆنیزمەوە لە ساڵی (١٩٠٠ تا ١٩٨٧) نزیکەی (١١٠) ملیۆن کەسی بیانی و ناوخۆیی کوژراون. لەژێر دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکاندا مسوڵمانان ڕووبەڕووی ترسناکترین کاری دڕندەیی و کۆمەڵکوژی هاتوون، لەوانە: لە ساڵی ١٩٢١ ڕووسەکان سەد هەزار مسوڵمانیان لە برساندا لە کریمیا قڕکرد، لە ماوەی تەنها دوو ساڵدا (١٩٣٢-١٩٣٤) سێ ملیۆن تورکستانی بەهۆی برسێتییەوە گیانیان لەدەستدا، لە ساڵی ١٩٣٤ لە تورکستان (٣٠٠) هەزار مسوڵمان دوورخرانەوە، لە ساڵی ١٩٥٠ نزیکەی حەوت هەزار مسوڵمان کوژران. بەدەر لە کۆمەڵکوژی، تەنها لە دەوڵەتی تورکستاندا (٦٦٨٢) مزگەوت ڕوخێنران یان بۆ مەبەستی دیکە بەکارهێنران، هەروەها (٧٠٥٢) قوتابخانە داخران.

ئەو مسوڵمانانەشی زیندانی دەکران، ڕووبەڕووی چەندین جۆری ئەشکەنجە دەبوونەوە، وەکو: داکوتینی بزماری درێژ لە سەریان، بەستنی کڵاوی کانزایی لەسەریان و پاشان کارەبا لێدانیان، دڕاندنی جەستەیان بە بەستنەوەیان لە هەردوو لاوە بە ئامێرێکی بەهێزەوە کە هەر ئەندامێک بە جیا ڕادەکێشێت تاوەکو لە باقی جەستە جیای دەکاتەوە. ڕشتنی بەنزین بەسەریاندا و سوتاندنیان، بەکارهێنانی زیندانییەکان وەک نیشان بۆ تەقەکردن لەلایەن سەربازە ڕووسییەکانەوە لە کاتی مەشقە سەربازییەکانیاندا.

لەئێستادا ڕووسەکان ژمارەی ڕاستەقینەی مسوڵمانان لە ناوخۆی وڵاتەکەیدا ئاشکرا ناکەن، بەڵام ئامارە نافەرمییەکان ژمارەیان بە (٢٠-٣٠) ملیۆن کەس دەخەمڵێنن.

## 1

## کریمیا: پایتەختێکی داگیرکراو

کریمیا یەکێکە لە جوانترین ناوچەکانی جیهان، بۆماوەی چەند سەدەیەک مسوڵمانانی تاتار تیایدا نیشتەجێبوون و میرنشینی ئیسلامییان تیایدا دامەزراند، ڕۆژگارێک مۆسکۆ ملکەچیان بوو، تەنانەت جیزیەیان دەدا بە میرەکەی. کریمیا دەکەوێتە سەر دەریای ڕەش، تەنها لە باکوورەوە لەڕێگەی شریتێکی تەسکەوە بە وشکانی کیشوەرەکەوە بەستراوەتەوە. ڕووبەرەکەی (٢٧) هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، ژمارەی دانیشتووانەکەی (٢.٥) ملیۆن کەسە. ڕووسەکان نزیکەی (٥٠٪) و ئۆکرانییەکان (٣٠٪) و مسوڵمانانیشی باقی دیکەی دانیشتوانی دوورگەکە پێکدەهێنن. پایتەختەکەی «سیمفێرۆپۆل»ە، پێش ئەوەی لەلایەن ڕووسەکانەوە دەستی بەسەردا بگیرێت پێی دەگوترا «ئاق مەسجید» واتە مزگەوتی

سپی. کریمیا لە ساڵی ١٩٥٤ بووەبە بەشێک لە ئۆکراینا، کاتێک نیکیتا خرۆشۆف سەرۆکی سۆڤیەت – کە بە ڕەچەڵەک ئۆکرایینیە – بڕیاریدا بیکاتە ناوچەیەکی سەر بە ئۆکراینا.

هۆزی زێڕینی مسوڵمانان

لە ساڵی ١٣٣٩، لەکاتێکدا کە تاتارەکان وڵاتانی جیهانی ئیسلامیان داگیر دەکرد تاوەکو پایەتەختی ئەوکاتەی خەلافەت –بەغدا–یان ڕووخاند، خودا دڵی هۆزێکی تاتاری بۆ ئیسلام کردەوە و مسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند، کە بە هۆزی زێڕین دەناسران، سەرۆکی ئەم هۆزە «باتوخان» بوو کە یەکێکە لە نەوە بەناوبانگەکانی جەنگیزخانی سەرکردەی ناسراوی تاتارەکان. لە ڕێگەی ئەم هۆزەوە ئیسلام بەدرێژایی ڕووباری ڤۆڵگا دەستی بە بڵاوبوونەوە کرد (ڕووبارەکە لە مۆسکۆوە سەرچاوە دەگرێت و دەڕژێتە ناو دەریای قەزوینەوە)، بەم جۆرە ڤۆڵگا لە سەرچاوەکەیەوە تا ڕێژگەکەی بووە ڕووبارێکی ئیسلامی. ئیسلام لە ڕێگەی تاتارەکانەوە لە ناوچەی چیای ئۆرال بڵاوبووەوە، میرنشینی قیبشاک سەریهەڵدا، کە یەکێک بوو لە شانشینە گەورەکانی مەغۆلەکان و ناوچەیەکی فراوانی ڕووسیا و سیبیریای بەدەستەوە بوو، شاری سارای لەسەر ڕووباری ڤۆڵگا کردە پایتەخت.

بەتێپەڕبوونی کات، لە سایەی ئەم هۆزەوە تەواوی نیمچە دورگەی کریمیا مسوڵمان بوون، تەنانەت زۆربەی ئەو ناوچانەی کە دواتر بە یەکێتی سۆڤیەت ناسران، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی تاتارە مسوڵمانەکانەوە، دەسەڵاتیان بۆ نزیکەی سێ سەدە بەردەوام بوو، لەو ماوەیەدا مۆسکۆ میرنشینێکی بچووک بوو کە ملکەچی حوکمڕانی میری مسوڵمانی کازان بوو، باجی دەدا و حاکمەکەی تەنها دوای ڕاوێژکردن بە میر دادەنرا. لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا ناکۆکی لە نێوان فەرمانڕەوا لاوازەکاندا دروستبوو، کەوتنە دوژمنایەتی لەگەڵ میرنشینەکەدا، ئەمەش هۆکارێکی بەهێز بوو بۆئەوەی ڕووسەکان دەست بەسەر دوورگەکەدا بگرن. لە ساڵی ١٥٥٢دا تزاری ڕووسیا «ئیڤانی ترسناک»، توانی میرنشینە ئیسلامییەکان لە دوورگەکەدا لەناوببات، دواتر بوون بە سێ ئیدارەی بچووک: ئەستراخان، کازان و کریمیا.

لە ساڵی ١٦٧٨ پیتەری یەکەم گەمارۆی کریمیایدا، دواتر لە سەردەمی ئیمپراتۆرە ئانا ئیوانۆڤنا لە ساڵی ١٧٣٦ سوپای ڕووسیا بەخێرایی پایتەختی داگیرکرد، بەڵگەنامەکان و هێما مێژووییەکانی مسوڵمانانی تاتاری ناوچەکەیان سووتاند.

**کۆمەڵکوژی دژی مسوڵمانان**

هەر کە ڕووسەکان دەستیان بەسەر دوورگەکەدا گرت، وێرانکارییان بەسەردا هێنا، مسوڵمانیان کوشت و سووکایەتییان بە هەموو شتێکی مسوڵمانان کرد، وەکو خەڵک و باڵەخانە و کتێب و دەستنووسەکانیان، لەگەڵ هەڵمەتی دوورخستنەوەی سەدان هەزار مسوڵمان، کە بە یەکێک لە توندوتیژترین هەڵمەتەکانی ڕاگواستن و کۆچکردنی زۆرەملێ لە سەدەی هەژدە و دواتردا دادەنرێت.

لە ساڵی ١٧٧١ سوپای ڕووسیا دروشمە بەناوبانگەکەی خۆی (بەبێ چاوەڕوانی و گەڕانەوە، دەبێت تاتارەکان لەم خاکە بسڕدرێنەوە) جێبەجێ کرد، لەو ماوەیەدا دەیان کۆمەڵکوژییان ئەنجامدا و زیاتر لە (٣٥٠) هەزار مسوڵمانی تاتاریان کوشت، تا ئەو ڕادەیەی کەس نەبوو تەرمەکان بنێژێت، بەوهۆیەوە پەتایەک بڵاوبووەوە کە بووە هۆی لەناوچوونی ڕووسە بکوژەکانیش. هەروەها نزیکەی (٥٠٠) هەزار مسوڵمانیان لە وڵاتەکەیان دوورخستەوە و ڕووسەکان جێگەیان گرتنەوە. بەهۆی پەلامارە هۆڤانەکانی ڕوسەکانیشەوە، نزیکەی یەک ملیۆن و بیست هەزار مسوڵمان بەرەو تورکیا هەڵاتن.

لە ساڵی ١٧٨٣ هێزەکانی ڕووسیا چەندین هەڵمەتی ڕاگواستنی مسوڵمانانیان بۆ وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و تورکیا و بولگاریا و ڕۆمانیا، هەروەها بۆ سیبیریاش ئەنجامدا کە بە گەورەترین بیابانی بەفراوی لە جیهاندا دادەنرێت. جگەلەوەی مزگەوت و قوتابخانە و ماڵەکانیان ڕووخاند، قورئان و هەموو بەڵگەنامەکانیان سووتاند، کە بۆ تاتارەکانی کریمیا بە میراتێکی مێژوویی و کولتووری گرنگ دادەنرا.

بەلشەفییەکانی ڕووسیا پاش ئەوەی گەیشتنە دەسەڵات، دوای زنجیرەیەک هێرش لە ساڵەکانی (١٩١٨-١٩٢٠) توانیان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر کۆماری کریمیای مسوڵماندا بسەپێنن، بەوپەڕی دڕندەییەوە مامەڵەیان لەگەڵ مسوڵمانانی کریمیادا کرد، کۆمەڵکوژییان کردن و لە ماڵەکانیان ئاوارەیان کردن. لە ساڵی ١٩٢٠ تاتارەکانی کریمیا دامەزراندنی کۆماری سەربەخۆی خۆیان بە سەرۆکایەتی نوعمان حاجیخان ڕاگەیاند، بەڵام هەر زوو کۆمۆنیستەکان حکومەتەکەیان ڕووخاند و سەرۆکی کۆمارەکەیان لەسێدارەدا و تەرمەکەیان فڕێدایە ناو دەریاوە، لە ساڵی ١٩٢٨ کاتێک جۆزێف ستالین ویستی قەوارەیەکی جولەکە لە کریمیا دابمەزرێنێت، تاتارەکان بە سەرۆکایەتی ئیمامی مزگەوتەکان و ڕۆشنبیران لە دژی ڕاپەڕین، وەڵامی ستالین-یش لەسێدارەدانی (٣٥٠٠) کەسیان بوو.

شەپۆلی لەسێدارەدان تەنیا هاوڵاتیانی ئاسایی نەگرتەوە، بەڵکو هەموو ئەندامانی حکوومەتی خۆجێیشی گرتەوە، بە وەلی ئیبراهیمی سەرۆک کۆماریشەوە. لە ساڵی دواتریشدا زیاتر لە چل هەزار تاتار بۆ ناوچەی دلۆڤسک لە سیبیریا ڕاگوێزران، بەهۆی ئەو شەپۆلی برسێتییەش کە لە ساڵی ١٩٣١ کریمیای گرتەوە، نزیکەی شەست هەزار کەس گیانیان لەدەستدا.

### دوای جەنگی دووەمی جیهانی

کۆمەڵکوژییەکانی ڕووسیا دژی مسوڵمانانی کریمیا، هەروەها پەیڕەوکردنی سیاسەتی ڕاگواستن و بەدڕەفتاری، جا لە سەردەمی تزارەکاندا بیووبێت یان لە سەردەمی بەلشەفیکەکاندا، بووە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی مسوڵمانان لە نۆ ملیۆن کەسەوە لە ساڵی ١٨٨٣ بۆ نزیکەی (٨٥٠) هەزار کەس لە ساڵی ١٩٤١دا، واتە ئەو ساڵەی کە ستالین نزیکەی شەست هەزار مسوڵمانی چەکدارکرد بۆئەوەی بەرەنگاری نازییەکان ببنەوە.

لەکاتی دەستبەسەراگرتنی کریمیاشدا، نزیکەی (٨٥) هەزاریان ڕەوانەی کەمپەکانی دەوروبەری بەرلین کران، تاوەکو لە کاری زۆرەملێدا سوودیان لێ وەربگیرێت.

لە ساڵی ١٩٤٤دا ستالین مسوڵمانانی کریمیای بە هاوکاریکردنی نازییەکانی ئەڵمانیا لە جەنگی دووەمی جیهانی تۆمەتبار کرد، بۆیە لە مانگی ئایاری هەمان ساڵدا زیاتر لە (٤٠٠) هەزار کەسیانی لە بارهەڵگری گواستنەوەی ئاژەڵدا بۆ ناوچە جیاوازەکانی یەکێتی سۆڤیەت بەتایبەتی سیبیریا و ئۆزبەکستان ڕاگواست، کە بووە هۆی گیانلەدەستدانی نزیکەی چواردە هەزار کەسیان، هەروەها (٤٥) هەزار کەسی دیکەیان لەو کەمپانەی تیایدا نیشتەجێکران بەهۆی نەخۆشی و برسێتییەوە لە ساڵی ١٩٤٨ گیانیان لەدەستدا.

جگەلەوەش سەربازە ڕووسەکان لە کریمیا هەرچی قورئان و کتێبێکی ئیسلامییان دەستکەوت سووتاندیان، ئیمامی مزگەوتەکانیان لەسێدارەدا، مزگەوتەکانیان کردە سینەما و کۆگا. تەواوی نووسراوەکانی مسوڵمانیان لەناوبرد، بەدەگمەن نووسراوێک ڕزگاری بووبێت.

## 2

### تورکستان: مزگەوت و کانزا و داگیرکاری

تورکستان وڵاتێکی دەوڵەمەندە بە سەرچاوە و سامانی سروشتیی، خاوەنی یەدەگێکی زۆری نەوت و گازی سروشتی و زێڕ و یۆرانیۆم و بەردی بەنرخە، نەوتەکەی چڕی کەمە و یەکێکە لە باشترین جۆرەکانی نەوت، خاوەنی زەوییەکی بەپیت و کەشوهەوایەکی جۆراوجۆر و سامانی کشتوکاڵی جیاوازە، سەرباری سامانی دەریایی لە دەریای خەزەر، لەڕووی ستراتیژییەوە ئەڵقەی بەیەکگەیاندنی نێوان چین و ڕۆژهەڵاتی ئاسیایە لە ڕۆژهەڵاتەوە، دەریاکانی باشووریشی دەروازەیەکە بۆ ناوچەی کەنداو و نەوتەکەی.

لەدوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت، بەسەر پێنج کۆماری ئیسلامیدا دابەشبووە: (کازاخستان، ئۆزبەکستان، تورکمانستان، تاجیکستان و قرغیزستان)، تورکستانی ڕۆژئاوا (تورکستانی ڕۆژهەڵات لەژێر کۆنترۆڵی چیندایە) لە باکوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ چیای ئۆراڵ، لە باشوورەوە لەگەڵ چیای هیندکوش و پامیر، لە ڕۆژهەڵات لەگەڵ چیای تیان شان، لە ڕۆژئاواش لەگەڵ دەریای خەزەر. ئەم ناوچەیە کۆمەڵێک هۆزی تورکی تێدا نیشتەجێن، دیارترینیان: کازاخ، قیرغیز، تورکمان و ئۆزبەکن.

بۆ یەکەمجار لە ساڵی (٨٨ – ٩٦) کۆچی، تورکستان لەلایەن فەرماندەی مسوڵمانان قوتەیبە بن موسلیم ئەلبەهیلی فەتح کرا و ئیسلام گەیشتە ئەم ناوچەیە. لەگەڵ هاتنی ساڵی ٩٤٣ز، تەواوی خەڵکی تورکستان بە سەرکردایەتی میری میرنشینی قەرەخان (ستووق باغرەخان خاقانی)، مسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند، لەوکاتەدا ژمارەیان زیاتر

لە دوو سەد هەزار خێزان بوو کە دەیکردە نزیکەی یەک ملیۆن کەس.
لە سەردەمی هارون بوگراخان، نەوەی ستوق باغرەخان، وڵاتەکە فراوانتر بوو تاوەکو بەشێک لە تورکستانی ڕۆژئاواشی گرتەوە، ئەمە جگە لەو پێشکەوتنەی کە زۆر بواری شارستانیەتی گرتەوە. زمانی تورکستانی بۆ یەکەمجار بەشێوەزاری ئویگور بە ڕێنووسی عەرەبی نووسرا، وەقفی قوتابخانەکان یەک لەسەر پێنجی زەوییە کشتوکاڵییەکانی پێکدەهێنا.
تورکستان لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بوو بە یەکێک لە بنکەکانی مەعریفە و زانست لە جیهانی ئیسلامیدا، زانایانی لە زانست و هونەرە جۆراوجۆرەکاندا بەرهەمهێنا، ناوچەی ئەلشاش (شاری تاشکەندی ئەمڕۆ) شوێنی زانایان بووە، لەوانە ئەبوبەکر ئەلقەفال ئەلشاشی و محەمەد بن عەلی بن ئیسماعیل ئەلشاشی، کە لەساڵی ٢٩١ک لەدایکبووە و لە ساڵی ٣٦٥ک کۆچی دوایی کردووە. لە گەورەترین زانایانی سەردەمی خۆی بووە لە بوارەکانی فیقە و فەرموودە و زمان و ئەدەبدا، یەکەم کەس بووە کە مشتومڕی باشی لە نێوان فەقیهەکاندا پۆلێن کردووە، لەوەوە عەقیدەی شافیعی لە وڵاتەکەیدا بڵاوبۆتەوە.

**مێژووی داگیرکاری ڕووسەکان**

تزارەکانی ڕووسیا دوای شەڕێکی چەند ساڵە لە تەممووزی ١٨٦٧دا، دامەزراندنی دەوڵەتی تورکستانی ڕووسیایان لە شاری تاشکەندی پایتەخت ڕاگەیاند، بەگوێرەی بەڵگەنامە مێژووییەکان هەوڵی داگیرکاری ڕووسەکان بۆ ساڵی ١٥٨٧ دەگەڕێتەوە، چونکە لەو ساڵەدا ڕووسەکان بە ئامانجی پاراستنی ڕێڕەوی بازرگانی نێوان چین و ڕووسیا، قەڵایەکیان لەسەر ڕووباری ئێرتیش دروستکرد، ئەو ڕووبارە لە چینەوە هەڵدەقوڵێت و لە باکوورەوە دێتە ناو ڕووسیاوە.
هەوڵە جددییەکان بۆ داگیرکردن لە سەردەمی تزار پیتەری گەورە (١٦٨٢- ١٧٢٥) دەستیپێکرد، هەرچەندە ئەو کاتەی لەسەر تەختی ڕووسیا دانیشت تەمەنی تەنها دە ساڵ بوو، بەڵام لە ساڵی ١٧١٤ هێزێکی سەربازی گەورەی نارد و هەوڵیدا بنکەیەک لەسەر ڕووباری ئێرتیش لە ناوچەی جونگارەکان دابمەزرێنێت، کە یەکێکن لە هۆزە مەنگۆلییە بوداییەکان، بەڵام شکستی هێنا، دوای شەش ساڵ دووبارە هەوڵێکی دیکەی دایەوە، لەمکاتەدا جونگارەکان بەهۆی ململانێکانیان لەگەڵ چیندا تەواو لاواز ببوون، بۆیە ڕووسەکان ئەم دەرفەتەیان قۆستەوە و ئەوانیش نەیانتوانی بەرەنگاریان ببنەوە، پاشان چەندین قەڵایان لەسەر ڕووبارەکە دروستکرد.
لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی بەلشەفییەکان لە ساڵی ١٩١٧، مارکسییە بەلشەفییەکان و لینینی ڕێبەریان بەڵێنی سەربەخۆیی و ئازادییان بە مسوڵماناندا، ئەگەر لەگەڵ شۆڕشی

کۆمۆنیستی بن و دژی دەسەڵاتی تزارەکان بوەستنەوە. مسوڵمانەکان ڕاستگۆیانە بەدەمیانەوە چوون و پشتگیریان لە سوپای سوور کرد هەتا سەرکەوتن و یەکێتی سۆڤیەتیان دامەزراند. کاتێک تورکستانییەکان بۆ جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنانەی کە بەلشەفییەکان پێیاندابوون، ویستیان سەربەخۆیی ڕابگەیەنن، کتوپڕ کۆمۆنیستەکان لێیان هەڵگەڕانەوە و چەندین کۆمەڵکوژی قێزەونیان لە دژی مسوڵمانان ئەنجامدا. ڕەنگە دیارترینیان کۆمەڵکوژییەکەی ساڵی ١٩٢٠ بووبێت، کە بەدەستێکی ئاسنین لە دژی هاوڵاتیان وەستانەوە و مزگەوت و قوتابخانە ئاینیەکانیان وێران کرد.

**کۆمەڵکوژی مسوڵمانان**

لە ساڵی ١٩٣٤ کۆمۆنیستەکان لە تورکستان نزیکەی سەد هەزار مسوڵمانیان لە ئەندامانی حکومەتی خۆجێی و زانا و ڕۆشنبیر و بازرگان و جووتیاران کوشت، هەروەها (٥٠٠) هەزار مسوڵمانیان دەستگیرکرد، لە ساڵانی (١٩٣٧ – ١٩٣٩) ژمارەیەکی زۆریان بۆ جەنگەڵەکانی سیبیریا ڕاگوێزران، کۆمەڵێکی دیکەشیان لەسێدارەدران، ئەوانی دیکەیشیان بێگارییان پێدەکرا.

لە ساڵی ١٩٤٩ دوو هەزار تورکستانی بەرەو هیندستان هەڵاتن، بەڵام لە ڕێگەدا (١٢٠٠) کەسیان گیانیان لەدەستدا. لە ساڵی ١٩٥٠ نزیکەی حەوت هەزار مسوڵمان لەو وڵاتە کوژران، (٣٠٠) هەزاری دیکەش دوورخرانەوە، لە ساڵی ١٩١٩وە تا ئەمڕۆ ژمارەی ئەو کەسانەی لە تورکستان ڕاگوێزراون نزیکەی دوو ملیۆن و نیو مسوڵمانی تێپەڕاندووە.

لە ماوەی ساڵانی (١٩٣٢-١٩٣٤) بەهۆی دەستبەسەرداگرتنی بەروبوومی تورکستان لەلایەن ڕوسەکانەوە و بەخشینی بەو چینیانەی هێنرابوونە وڵاتەکەوە، هەروەها بەهۆی دوورخستنەوەی چل هەزار مسوڵمانەوە بۆ ئۆکراینا و ناوەڕاستی ڕووسیا، نزیکەی سێ ملیۆن تورکستانی بەهۆی برسێتییەوە گیانیان لەدەستدا.

ڕووسەکان مزگەوتەکانیان ڕووخاند و کردیان بە شوێنی کات بەسەربردن، کۆی گشتی ئەو مزگەوتانەی کە تەنها لە تورکستان ڕووخێنران یان بۆ مەبەستی تر بەکارهێنرا، گەیشتە (٦٦٨٢) مزگەوت و نوێژگە، لەوانە گەورەترین مزگەوتە دێرینەکانی وەک (مزگەوتی کەلان) لە شاری بوخارا و (مزگەوتی کوتا) لە شاری قوقان، (مزگەوتی ئیبن قوتەیبە)، (مزگەوتی میر فەزل بن یەحیا) و (مزگەوتی خواجە ئەحرار) لە شاری تاشکەند. جگەلە داخستنی (٧٠٥٢) قوتابخانە و تەکیە لە ناوچە جیاجیاکانی وڵاتدا. بەدەر لەوانە، ڕووسەکان دەستیانکرد بە تیرۆرکردنی زانایانی ئاینی، لە دیارترین ئەو زانایانەی کە تیرۆرکران شێخ بورهان بوخاری سەرۆکی دادوەران (قاضی القضاة)، شێخ خان مەروان خان موفتی بوخارا، شێخ عەبدولموتەلیب واملا، شێخ مەحسوب متەوەلی، شێخ

عەبدولئەحەد وادخان، شێخ مەلا یەعقوب، شێخ مەلا عەبدولکەریم و زۆری تریش. ئەمەش بووە هۆی بڵاوبوونەوەی نەزانیی و نەخوێندەواری.

کوشتاری ڕووسەکان تەنها هاوڵاتیانی نەگرتەوە، بەڵکو کۆمۆنیستەکان لە ساڵی ١٩٣٤ سەرۆکی کۆماری تورکستان حاجی خۆجە نیاز، سەرۆکوەزیران مەولانا ثابت، فەرماندەی پارێزگای (ئاڵتا) شەریف حاج، فەرماندەی (پارێزگای کەشفەر) عوسمان ئۆران، یونس بەگ وەزیری دەوڵەت، حاجی ئەبولحەسەن وەزیری بازرگانی و تاهیر بەگ سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران، عەبدوڵڵا داملا وەزیری ئەشغاڵ و چەندانی دیکەیان کوشت.

بەم شێوەیە ڕووسەکان تورکستانیان کردە وڵاتێکی وێرانە و دواکەوتوو، تەنانەت دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەت و سەربەخۆیی وڵاتەکەش، چەندین دیکتاتۆری عەلمانی دەسەڵاتیان گرتە دەست، کە درێژەیان بە سەرکوتکردن و گۆشەگیرکردنی هەر ڕەوتێکی ئیسلامی دەدا کە داوای ڕزگاری و سەربەخۆیی بکات.

## 3

## چیچان: قوربانی سەربەخۆیی

پرۆسەی داگیرکاری ڕووسیا بۆ چیچان، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی هەژدە، کاتێک لەدوای بەرخۆدانێکی درێژخایەن و توند لە سەردەمی جەنگی قەفقازدا، بەرزاییەکانی چیچان داگیرکرا، لێرەوە چیچان کەوتە ژێر چنگی ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا. لە ساڵی ١٩٢٢ بە فەرمی بە ڕووسیای بەلشەفیکەوە لکێنرا، جارێکی دیکە لەژێر دەستی جۆزێف ستالین لەژێر ناوی «کۆماری سۆسیالیستی سۆڤیەتی ئۆتۆنۆمی چیچان-ئینگوش» دامەزرێنرایەوە. لە ساڵی ١٩٤٤ لەسەر فەرمانی لاڤرێنتی بێریا و بە تۆمەتی هاوکاریکردن لەگەڵ هێزەکانی ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی دووەمدا، نزیکەی دوو ملیۆن چیچانی و ژمارەیەک لە گەلانی دیکەی باکووری قەوقاز بۆ سیبیریا و ئاسیای ناوەڕاست ڕاگوێزران و کۆماری ئەنگوشیا و چیچانیش هەڵوەشێنرایەوە.

لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٩١ میخائیل گۆرباچۆڤی دوایین سەرۆکی سۆڤیەت، لە پشووی هاوینەی خۆیدا لە کریمیا تووشی هەوڵی کودەتا بوو، ئەو ڕووداوە هێندەی تر دۆخی یەکێتی سۆڤیەتی شلۆق کرد، هەروەها مەیلی جیابوونەوەش لە سۆڤیەت لە گەشەسەندندا بوو، بۆیە تەنها دوای دوو ڕۆژ لەو کودەتا شکستخواردووە، ئەفسەری باڵا لە هەواڵگری سۆڤیەت جەوهەر دۆدایڤ، سەربەخۆیی چیچان و ئینگۆشیای ڕاگەیاند.

دۆدایڤ پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ بۆریس یەڵتسنی سەرۆکی ڕوسیادا هەبوو، پێیوابوو لە پاداشتی پشتگیریکردنی لەکاتی هەوڵی کودەتاکەدا، پشتیوانی لە جیابوونەوەی چیچان دەکات. هەرچەندە یەڵتسن لە سەرەتادا نارەزایی نیشان نەدا، بەڵام دوای هێوربوونەوەی

دۆخی مۆسکۆ، پشتگیری لە سەرکردە چیچانییەکانی نەیاری دۆدایڤ کرد، هەروەها سەرکردە سەربازییە ناوخۆییەکانی هاندا چەکی لە دژی هەڵبگرن، ئەوەش وەک سزایەک لەپای ڕەتکردنەوەی واژۆکردنی پەیماننامەی فیدراسیۆنی ڕووسیا، کە لە مانگی ئازاری ١٩٩٢ پێشنیازکرا بۆ واژۆکردن، بەڵام چیچان تاکە هەرێم بوو کە خۆی لە واژۆکردن بەدوور گرت.

لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩٤دا، ڕژێمی دۆدایڤ دوچاری کودەتایەکی سەربازی خوێناوی هات، کە لەلایەن هەواڵگری ڕووسیاوە سازکرابوو، بەڵام کودەتاکە شکستی هێنا. لەگەڵ شکستی کودەتاکەدا مۆسکۆ بڕیاریدا بەفەرمی هێرش بکاتە سەر چیچان، لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٥دا سی هەزار سەربازی ڕەوانەی چیچان کرد، دوای تۆپباران و بۆردومانێکی چڕی ئاسمانی چوونە ناو شاری گرۆزنی پایتەختەوە، کە زیاتر لە کۆمەڵکوژییەکی ڕێکخراو دەچوو نەک شەڕ، لە ئەنجامدا (٢٥) هەزار چیچانی کوژران کە زۆربەیان مەدەنی بوون، نزیکەی نیو ملیۆن مسوڵمانی دانیشتوی وڵاتەکەش ئاوارەبوون، لە بەرامبەردا نزیکەی پێنج هەزار سەربازی سوپای ڕووسیا کوژران.

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٦دا، دوای چاودێریکردنی پەیوەندییە تەلەفۆنیەکانی، ڕووسەکان توانیان جەوهەر دۆدایڤ بە گورزێکی مووشەکی تیرۆر بکەن، ئەمەش گڕی بەردایە جۆش و خرۆشی چیچانیەکان، بەتایبەتی دوای پەیوەستبوونی ژمارەیەکی زۆری چەکدارە گەڕاوەکانی ئەفغانستان، ئەمەش ڕووسەکانی زیاتر نیگەران کرد، تاوەکو لەکۆتاییدا واژویان لەسەر ڕێکەوتنامەی ئاگربەست و کشانەوەی هێزەکانیان کرد، بەمەش دۆسییەی جەنگی یەکەمی چیچان داخرا، دوای ئەوەی نزیکەی (٨٠ – ١٠٠) هەزار کوژراوی لێکەوتەوە، جگەلە وێرانکردنی تەواوی وڵاتەکە.

### جەنگی دووەمی ڕوسیا

داگیرنەکردنی چیچان لەماوەی سێ ساڵی جەنگی یەکەمدا، یەڵتسن و سوپاکەی تەواو نیگەران کردبوو، بۆیە بەدوای دەرفەتێکدا دەگەڕان تاوەکو تۆڵەی خۆیان بکەنەوە و شکۆ بۆ سوپاکەیان بگێڕنەوە. هەروەها چیچانیش لەناوخۆدا توشی شڵەژان هاتبوو، بزووتنەوە جیهادییەکان دەرکەوتبوون کە داوای یەکگرتنی کۆمارە ئیسلامیەکانیان لە قەفقاز، چیچان، ئینگۆشیا و داغستان دەکرد.

لە ڕووسیا گۆڕانکارییەکی دیکە ڕوویدا، لە مانگی ئابی ١٩٩٩ سەرۆکی ئەوکاتەی دەزگای هەواڵگری ڤلادیمێر پوتین بە سەرۆک وەزیران و پاشان بە سەرۆکی بەوەکالەتی ڕووسیا دیاریکرا. ڕاسپاردنی پوتین هاوکات بوو لەگەڵ هەوڵی گرووپە جیهادییەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی هەندێک ناوچە لە داغستان. بۆیە لە ٥ی ئەیلولی هەمان ساڵدا، فڕۆکەکانی ڕووسیا چەند شوێنێکیان لە گرۆزنی پایتەختی چیچان بۆردومان کرد، مۆسکۆش

ڕایگەیاند کە چیتر دان بە دەسەڵاتی ئەسلان ماسخادۆڤی سەرۆکی چیچاندا نانێت، بەمەش جەنگی دووەمی لەدژی چیچان ڕاگەیاند.

له (٢٣)ی هەمان مانگدا ڕووسیا نزیکەی سی هەزار سەربازی بردە سنووری چیچان، لە یەکەم ڕۆژی ساڵی ٢٠٠٠دا، واتە تەنها دوای یەک ڕۆژ لە وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی وڵات لەلایەن پۆتینەوە، هێزەکانی ڕوسیا گەیشتنە دەوروبەری گرۆزنی. لە مانگی نیساندا مەسخادۆڤ پێشنیازێکی بۆ ئاشتی پێشکەش کرد، بەڵام مۆسکۆ ڕەتیکردەوە، چونکە لەوکاتەدا پوتین دروشمی شەڕی لەناوبردنی مسوڵمانانی لە قەفقاز بەرزکردبۆوە.

پوتین و سوپاکەی لە ئەنجامدانی پێشێلکاریی بەربەرییانە لەدژی مسوڵمانانی چیچان درێغییان نەکرد، تەنها لەماوەی یەک مانگ بۆردومانی ئاسمانیدا (٦٠٪)ی ژێرخانی وڵاتەکەیان وێرانکرد، زۆرینەی هەرە زۆری پردەکان و وێستگەکانی کارەبا و تاوەرەکانی تەلەفۆن و پەیوەندیکردنیان لەناوبرد. پوتین سیاسەتی زەوی سووتاوی پەیڕەو دەکرد، سەرەتا تۆپباران و بۆردومانی ئاسمانی گوند و شار و شارۆچکەکانی دەکرد، تاوەکو دانیشتوانەکەی هەڵبێن.

ماسخادۆڤ هەوڵیدا پایتەخت بەهێز بکات، بۆیە خەندەقی بەدەوری شارەکەدا هەڵکەند و تەواوی بیناکانی مینڕێژ کرد، لە سەرەتادا پلانەکەی سەرکەوتوو بوو، توانی زیانێکی زۆر بە سوپای ڕووسیا بگەیەنێت، بەڵام لە کۆتایی مانگی تشرینی دووەمی ١٩٩٩دا ڕووسەکان گەمارۆی شارەکەیان توندتر کرد، ئەوەش سەرۆکی چیچانی ناچارکرد لەگەڵ کۆمەڵێک پاسەوانی تایبەتیدا بەرەو دەرەوەی شارەکە هەڵبێن. لە ٦ی شوباتی٢٠٠٠دا ڕووسەکان ئاڵای خۆیان لە ناوەڕاستی گرۆزنیدا هەڵکرد و تەواوی بینا بۆمبڕێژکراوەکانیان تەقاندەوە.

دوای تەواوبوونی شەڕەکە، ڕێکخراوی هیومان ڕایتس ووچ ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوە، ڕووسیا بە ئەنجامدانی چەندین کۆمەڵکوژی بەرفراوان لە شار و گوندەکانی چیچان تاوانبار دەکات. هەروەها دەڵێت: سیاسەتی زەوی سووتاوی پوتین، دەیان هەزار کوژراو و بریندااری لێکەوتۆتەوە، سەرباری زیانە مادییەکان کە ئەژمارکردنیان مەحاڵە. ڕێکخراوەکە ئاماژەی بەوەشکردووە، بۆردومانە ئاسمانییە بەردەوامەکانی هێزەکانی ڕووسیا بۆ سەر دانیشتوانی مەدەنی، بووەتە هۆی ئەوەی زیاتر لە (٢٠٠) هەزار چیچانی بۆ ئەنگوشیای دراوسێ هەڵبێن، ئەمەش بارگرانییەکی بەرگە نەگیراوی خستۆتە سەر دانیشتوانی ئەو ناوچەیە، کە ژمارەیان لە (٣٠٠) کەس هەزار زیاتر نییە.

ڕاپۆرتەکە ئاشکرای کردووە، سەربازەکانی ڕووسیا بە ڕۆژی ڕووناک چوونەتە سەر ماڵی چیچانییەکان و تاڵانیان کردوون، تەنانەت کەلوپەلەکانیان بە ئیڤای سەربازی بۆ سەربازگەکانیان گواستۆتەوە، بەبێ ئەوەی کاربەدەستانی ڕوسیا هیچ هەڵوێست و کاردانەوەیەکیان هەبێت.

## 4
## بۆسنە: کۆمەڵکوژی بە پاڵپشتی ڕووسیا

کۆماری بۆسنە و هەرزەگۆڤینا یەکێک بوو لە دەوڵەتەکانی ژێر ئاڵای کۆماری یوگۆسلاڤیای گەورە و دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکان، کە بەر لە هەڵوەشانەوەی حەوت دەوڵەتی تەواوی لەخۆدەگرت (کرواتیا – سربیا – بۆسنە و هەرزەگۆڤینا – سلۆڤینیا – مۆنتینیگرۆ – مەقدۆنیا – کۆسۆڤۆ)، بە یەکێک لە بەهێزترین وڵاتانی ئەوروپا دادەنرا.

لەدوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت، دەستبەجێ سلۆڤینیا لە ساڵی ١٩٩١ جیابوویەوە و سەربەخۆی خۆی ڕاگەیاند. بۆسنەش بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لە ٢٩ی شوباتی ١٩٩٢ ڕیفراندۆمی ئەنجامدا، بەڵام سیاسەتکارە سرپبییەکان بایکۆتیان کرد. زۆرینەی بەشداربووانی ڕاپرسییەکەش دەنگیان بۆ سەربەخۆییدا. لە بەرامبەر زیادبوونی دانپێدانانی نێودەوڵەتی بەم کۆمارە نوێیەدا، دەسەڵاتدارانی سرپبیا دەستیان بە جموجۆڵی سەربازی کرد، هێزەکانی سرپی بۆسنە لەلایەن حکومەتی سربیا بە سەرۆکایەتی سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ و میلیشیای سوپای گەلی یوگۆسلاڤیا پاڵپشتی دەکران و شەڕیان لە دژی مسوڵمانانی بۆسنە ڕاگەیاند.

لە مانگی نیسانی ١٩٩٢ یەکەم پریشکی شەڕی چوار ساڵە دەستیپێکرد، لەم شەڕەدا چەندین پێشێلکاری دڕندانە ئەنجامدران، لەوانە پاکتاوکردنی نەژادی، کۆمەڵکوژی، لاقەکردنی ژنان، ئاوارەبوونی خەڵکی مەدەنی.

**کۆمەڵکوژی سرێبرینیکا**

لە ئازاری ١٩٩٥ ڕادۆڤان کارازیچی سەرکردەی سربەکان بڕیاری ئابڵوقەدانی بۆسنە و گەمارۆدانی گەلەکەی و برسیکردنیانیدا، شاری سرێبرینیکا یەکێک بوو لە گرنگترین ئەو ناوچانەی کە مسوڵمانەکانی کۆمارەکەی لێبوو، سربەکان بڕیارەکانی نەتەوەیەکگرتوەکانیان فەرامۆشکرد و دەستیانکرد بە پەلاماردانی شارەکە، لە حوزەیرانی ١٩٩٥دا، هێزەکانی سربیا کە پشتیوانی سەربازیی و لۆجستیان لە مۆسکۆوە بۆ دەهات، توانیان بچنە ناو شاری سرێبرینیکاوە و داگیری بکەن و زنجیرەیەک تاوان و پێشێلکارییان ئەنجامدا. دوای ئەوەی سربەکان چوونە ناو شارەکەوە، نێرینە تەمەن (١٤ – ٥٠) ساڵەکانیان لە ژنان و پیر و منداڵان جیاکردەوە، پاشان هەموویانیان کوشت و خستنیانە ناو گۆڕی بەکۆمەڵەوە، هەروەها هەڵمەتی لاقەکردنی ڕێکخراویان لە دژی ژنانی مسوڵمان ئەنجامدا، هەندێک لە ژنانیان هەر بەزیندوویی خستە ناو گۆڕی بەکۆمەڵەوە. لە ئاکامی ئەم پەلامارەدا هەشت هەزار مسوڵمان کۆمەڵکوژ کران و دواتریش ئەم ڕووداوە بە جینۆساید ناسێنرا.

له ساڵانی جەنگدا زیاتر لە دوو ملیۆن کەس ئاوارە بوون، هەروەها لە نێوان (١٢ بۆ ٥٠) هەزار ژن لاقە کران، لەکاتی گەمارۆدانی بۆسنەشدا زیاتر لە چواردە هەزار کەس گیانیان لەدەستدا. هەروەها زیاتر لە (٨٠٠) مزگەوتیان لە شار و گوندەکانی بۆسنە و هەرزەگۆڤینا ڕووخاند، زیاتر لە ملیۆن و نیویک کتێب و دەستنووسیان سووتاند، جگەلە کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی ئاینی و ئیمامی مزگەوتەکان و ڕۆشنبیران و بازرگانەکان.

سەرباری جیاوازی ئامارەکان لەسەر قوربانیانی ئەو شەڕە، هەندێک دەڵێن لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا زیاتر لە (٢٥٠) هەزار کەس کوژراون و دوو ملیۆن کەسیش ئاوارە بوون، واتە نزیکەی نیوەی دانیشتووان، جگەلە حاڵەتەکانی لاقەکردنی منداڵان و گەنجان، لەهەمانکاتدا سربەکان (٢٦) کۆمەڵکوژییان لە دژی مسوڵمانانی بۆسنە ئەنجامداوە، کە تەنها کۆمەڵکوژی سرێبرینیکا ناسراوە، هەندێک سەرچاوە ژمارەی قوربانییەکانی بە (١٢) هەزار کوژراو دەخەمڵێنن، هەندێک سەرچاوەی دیکەش دەڵێن ژمارەی قوربانییەکان تەنها هەشت هەزار کەسە.

لە ساڵی ٢٠٠٥ لە دەیەمین ساڵیادی ئەو کۆمەڵکوژییانەدا، کۆفی ئەنان سکرتێری گشتی ئەو کاتەی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان ڕایگەیاند تاوانەکە بە پلەی یەکەم لە ئەستۆی ئەو کەسانەدایە کە پلانیان داڕشتووە و کۆمەڵکوژییەکەیان ئەنجامداوە و ئەوانەشی هاوکاریان کردوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەرپرسیارێتی دەکەوێتە سەر دەوڵەتە گەورەکان و نەتەوەیەکگرتووەکان، چونکە یەکەمیان نەیتوانی ڕێوشوێنی پێویست بگرێتەبەر و دووەمیان - واتە نەتەوەیەکگرتووەکان - پێش کۆمەڵکوژییەکە و لەکاتی کۆمەڵکوژیەکەشدا هەڵەی گەورەیان کرد. ئاماژەی بەوەشدا کارەساتی سرێبرینیکا «بۆ هەمیشە وەک خاڵێکی ڕەش لە مێژووی نەتەوەیەکگرتووەکاندا دەمێنێتەوە»، دادگای دادی نێودەوڵەتیش لە شوباتی ٢٠٠٧دا، ئەو کۆمەڵکوژییەی بە جینۆساید ناساند.

مسوڵمانانی بۆسنە جگەلە سرێبرینیکا، دووچاری چەندین کۆمەڵکوژی دیکە هاتوون، کە میدیاکان کەمتر تیشکیان خستۆتە سەر، کە تێیدا دەیان هەزار کەس گیانیان لەدەستداوە، لەوانە کۆمەڵکوژی شەڕی نەمسا (١٦٨٣-١٦٩٩)، پاشان کۆمەڵکوژیی ساڵی ١٧١١ کە تێیدا هەزار مسوڵمان لە سانجاک و مۆنتینیگرۆ کوژران، کۆمەڵکوژییەکەی (١٨٠٤-١٨٦٧)، کاتێک سربەکانی بۆسنە دەوڵەتی مەسیحییان لەوێ ڕاگەیاند، کۆمەڵکوژییەکی دیکە لە ساڵی (١٨٧٦-١٨٧٨)دا ڕوویدا کاتێک سربەکان دەستیان بەسەر کۆسۆڤۆ و سانجاکەکان و مۆنتینیگرۆدا گرت، جگەلە کۆمەڵکوژیەکی گەورە لە ماوەی ساڵانی (١٩١٤- ١٩٤٥) لەگەڵ دەستپێکردنی یوگسلاڤیای یەکگرتوودا، کە تێیدا پێنج هەزار مسوڵمان کوژران، زنجیرەی کۆمەڵکوژییەکان بە کوژرانی (١٠٣) هەزار مسوڵمان لە جەنگی دووەمی جیهانی لە (١٩٤١- ١٩٤٥) کۆتایی دێت.

## هاوکارییەکانی ڕووسیا

سەرۆکی پێشووی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی لە بۆسنە و هەرزەگۆڤینا، دکتۆر هاریس سیلادیچ لەمیانی بەشداریکردنی لە بەرنامەی «شاهد علی العصر»ی کەناڵی «ئەلجەزیرە» کە لە (٢٠١٥/١٢/٢٦) پەخشکرا، دەڵێت: سربەکان لە ماوەی شەڕەکەی (١٩٩٢-١٩٩٥)دا، لەڕووی سەربازیی و مەعنەوییەوە لەلایەن ڕووسەکانەوە پشتیوانی دەکران. لەلایەکی دیکەوە، ڕووسەکان بەرگرییەکی بێ وێنەیان لە ڕادۆڤان کارازیچ کرد کە بە «قەسابی بۆسنە» ناسراوە، جگەلەوەی لە هەشتی تەمووزی ٢٠١٥دا، ڕووسیا ڤیتۆی لەدژی بڕیارنامەی ئەنجومەنی ئاسایش بەکارهێنا، کە کۆمەڵکوژی سریێبرینیکای بە جینۆساید دەناساند.

## 5

## سوریا: کۆمەڵکوژی لە بەرگی هاوکارییدا

لە بەهاری ٢٠١١ لەچوارچێوەی بەهاری عەرەبیدا، دانیشتوانی سوریا خۆپیشاندانیان لە دژی ڕژێمی وڵاتەکەیان بە سەرۆکایەتی بەشار ئەسەد دەستپێکرد، بەڵام ئەسەد بە پشتیوانی ڕوسیا و ئێران تائێستا لە دەسەڵاتدا ماوەتەوە.

لە ٣٠ی ئەیلوولی٢٠١٥) پەرلەمان «دۆما»ی ڕووسیا ڕەزامەندی لەسەر جێگیرکردنی هێزەکانی ڕووسیا لەسەر خاکی سوریا دەربڕی، ئەوکات میدیای ڕووسیا و سوریا وەهایان بڵاوکردەوە ئەم هەنگاوە بۆ پاراستنی هاوڵاتیانی مەدەنییە لە گرووپە چەکدارەکان، بەڵام دواتر دەرکەوت ئامانج لێی هێشتنەوەی ئەسەد و قایمکردنی جێ پێی ڕوسیایە نەک تەنها لە سوریا، بەڵکو لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. لەم ماوەیەشدا بەدەر لە هاوکاری سەربازی، مۆسکۆ (١٣) جار ڤیتۆی لە دژی ئەو بڕیارانەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بەکارهێناوە کە تایبەت بوون بە سوریا، هەروەها هەموو بڕیارنامەکانی ئەنجومەنی مافی مرۆڤی نەتەوەیەکگرتوەکانی لەبارەی سوریاوە ڕەتکردۆتەوە.

بەگوێرەی ڕاپۆرتەکانی تۆڕی سوریا بۆ مافەکانی مرۆڤ، لە نێوان ٣٠ی ئەیلولی ٢٠١٥ تا ٣٠ی ئەیلوولی ٢٠١٩، لەو کاتەی هێزەکانی ڕووسیا هاتوونەتە سوریا، نزیکەی (٦٦٨٦) هاوڵاتی لە (٣٣٥) کۆمەڵکوژی مۆسکۆدا کوژراون، هەروەها لانیکەم (١٠٨٣) هێرش کراوەتە سەر دامەزراوە مەدەنییە گرنگەکان، لەنێویاندا (٢٠١) هێرش بۆ سەر قوتابخانەکان و (١٩٠) پەلامار بۆ سەر دامەزراوە پزیشکییەکان. هەر بەهۆی ئەو هێرشانەشەوە تائێستا نزیکەی (٣.٣) ملیۆن کەس ئاوارەبوون.

ڕاپۆرتەکان دەریدەخەن لەنێو قوربانییەکاندا (١٩٢٨) منداڵ و (٩٠٨) ژن (مێینەی پێگەیشتوو) هەبوون، لە ساڵی یەکەم و دووەمی دەستێوەردانەکەدا زۆرترین ژمارەی قوربانی تۆمارکراوە، شاری حەلەبیش لە پێشەنگی لیستی ئەو شارانەیە کە زۆرترین ڕێژەی قوربانی تێدا تۆمارکراوە کە (٢٧٩٩) کوژراوە، دواتر ئیدلب (٢٤٠٨) کوژراو، دێرەزۆر (٤١٧) کوژراو.

لە درێژەی ڕاپۆرتەکاندا هاتووە، لە ماوەی ساڵانی (٢٠١٥ - ٢٠١٦)، (٣٧٣٤) هاوڵاتی مەدەنی کوژراون کە (١٠٤٧) کەسیان منداڵ و (٤١٤)یان ژن بوون، هەروەها لە ساڵانی (٢٠١٦ - ٢٠١٧) هەزار و (٥٤٧) هاوڵاتی مەدەنی کوژراون کە (٤٤٨)یان منداڵ و (٢٣٦) ژن بوون، هاوکات لە ساڵانی (٢٠١٧ - ٢٠١٨)، (٩٥٨) هاوڵاتی مەدەنی کوژراون، لەنێویاندا (٣٥٤) منداڵ و (٢١١) ژن هەبووە، لە ساڵانی (٢٠١٨-٢٠١٩)دا (٤٤٧) مەدەنی کوژراون کە (٧٩)یان منداڵ و (٤٧)یان ژن بووە.

سەبارەت بە ژمارەی کۆمەڵکوژییەکان، لە ساڵانی (٢٠١٥ - ٢٠١٦)دا هێزەکانی ڕووسیا (١٧٢) کۆمەڵکوژییان ئەنجامداوە، لە ساڵانی (٢٠١٦-٢٠١٧)دا نەوەد کۆمەڵکوژی، لە ٢٠١٨دا (٥٩) کۆمەڵکوژی، لە ٢٠١٩دا چواردە کۆمەڵکوژی.

هێرشەکانی ڕووسیا فەرمانگە حکومییەکان و دامەزراوە خزمەتگوزارییەکانیشی گرتۆتەوە، لە ڕاپۆرتەکاندا هاتووە هێزەکانی ڕوسیا لانیکەم (١٠٨٣) هێرشیان بۆ سەر ناوەندە مەدەنییە گرنگەکان ئەنجامداوە، لەنێویاندا (٢٠١) هێرش بۆ سەر قوتابخانەکان و (١٩٠) هێرش بۆ سەر دامەزراوە پزیشکییەکان، لە دەستێوەردانی سەربازی ڕووسیاوە تا ٣٠ی ئەیلوولی٢٠١٩، بەهۆی هێرشەکانەوە (١٠٧) کارمەندی پزیشکی و بەرگری شارستانی کوژراون، جگەلە (٢١) میدیاکار.

### سەربازگە و تاقیگەی چەک

جگەلە ئەنجامدانی کۆمەڵکوژی، ڕووسەکان نوێترین و کوشندەترین چەکەکانی خۆیان لەسەر خاک و گەلی سوریا تاقیکردۆتەوە. لەوبارەیەوە سێرگی شۆیگو وەزیری بەرگری ڕووسیا ڕایگەیاند وڵاتەکەی "زیاتر لە (٣٠٠) جۆر چەکی ڕووسی لە سوریا" تاقیکردۆتەوە، ئەو چەکانەش بەگشتی کاریگەریی و بەهێزی خۆیان سەلماندووە. پێش ئەویش سەرۆکی ڕوسیا ڤلادیمێر پوتین ڕایگەیاندبوو «جەنگی سوریا گۆڕەپانێکی بەنرخی بۆ تاقیکردنەوەی چەکی ڕووسیا دابینکردووە، لە هەلومەرجێکی مەیدانی ڕاستەقینەدا کە گۆڕەپانی مەشق و ڕاهێنان هەرگیز دابینی نەدەکرد».

سەرباری تاقیکردنەوەی چەکەکانی، مۆسکۆ لە مانگی ئابی ٢٠١٥دا، ڕێککەوتنێکی لەگەڵ ڕژێمی ئەسەد واژۆ کرد بۆ دامەزراندنی «بنکەی ئاسمانی حمەیمیم» لە پارێزگای لازقییە لە کەنارەکانی سوریا، تاوەکو لەوێوە ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی ئەنجام بدات. ڕێککەوتنەکە ڕێگە بە ڕووسەکان دەدات بۆ ماوەی چل ساڵ لەو بنکە ئاسمانییە بمێننەوە، جگەلە مانەوەیان لەسەر زەوی، هەروەها یازدە کەشتی جەنگییان هەبێت، لەنێویاندا کەشتی کە بە هێزی ئەتۆمی کاردەکات، جگەلەوەی بژاردەی درێژکردنەوەی ئەم ڕێککەوتنەیان بۆ بیست و پێنج ساڵی دیکەش دەبێت. پاشان لە مانگی کانوونی دووەمی ٢٠١٧ مۆسکۆ بنکەیەکی هەمیشەیی هێزی دەریایی لە بەندەری تەرتووس لە باکووری ڕۆژئاوای سوریا دامەراند.

## سەرچاوەکان


١. عماد عنان: سجل الابادة و الدم.. تاريخ الهمجية الروسية ضد المسلمين، موقع نون بوست. (٢٠٢٠/٣/١٠).

٢. عماد عنان: لم تجد الجثث من يدفنها.. مذابح الروس بحق الملايين من مسلمى القرم، موقع نون بوست، (٢٠٢٠/٣/١٢).

٣. عماد عنان: قتلوا ١٠٠ ألف مسلم وهجروا ٢,٥ مليون الاخرين.. عن مذابح الروس فى تركستان، موقع نون بوست، (٢٠٢٠/٣/١٧).

٤. عماد عنان: الحرب الشيشانية.. الهمجية الروسية تودى بحياة مليون مسلم بين قتيل ومهجر، موقع نون بوست، (٢٠٢٠/٣/١٦).

٥. عماد عنان: البوسنه والهرسک.. المأساه التى أنتجها الدعم الروسى الاسود للصرب والكروات، موقع نون بوست، (٢٠٢٠/٣/١٨).

٦. عماد عنان: روسيا البوتينية.. الصعود عالميا على أشلاء السوريين وثروات بلادهم، موقع نون بوست، (٢٠٢٠/٣/٢١).